کۆمەڵەی ئارا
بۆ توێژینەوەی زانستی

# ئامادەکردنی
# توێژینەوەی زانستی

## بەکالۆریوس - ماستەر - دکتۆرا





د.غازي عناية

و. بەهرە محمد علی

چاپی دووەم

2006

# ئامادەكردنی توێژینەوەی زانستی

نووسینی

دكتۆر غازی عنایە

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە بەدەستكاری‌یەوە

د.بەهرە محەمەد عەلی

٢٠٠٦

- ناوی کتێب: ئامادەکردنی توێژینەوەی زانستی
- نووسینی: د.غازی عنایە
- بابەت:توێژینەوەی زانستی
- وەرگێرانی: د.بەهرە محەمەد عەلی
- تایپ: بەهار حەسەن سەعید
- پێداچوونەوە: گوڵنار وەسیم صادق
- نەخشەسازی بەرگ: ئومێد محەمەد قەرەداغی
- چاپ: دووەم
- تیراژ : ۲۰۰۰ دانە
- ژمارەی سپاردن:(۹۳۲) ی ساڵی ۲۰۰۵

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی

توێژینەوەی زانستی رۆڵی باش و کاریگەری هەیە لەباشتر ناسینی دیاردەکان، چ لەبواری زانستی سروشتیدا یان لەبواری زانستی مرۆڤایەتیدا بێت.

ئاێستاش وەکو پێش مەرجێك لە دامەزراوە ئەکادیمیە زانستیەکاندا بۆئەوەی سەرچاوەیەك بەسەرچاوەی زانستی لەقەڵەم بدرێت پێویستی بەوە هەیە کەبنەما بنچینەییەکانی توێژینەوەی زانستی تیادا فەراهەم بووبێت. تایبەتریش لەبوارە ئەکادیمیەکانی بەکالۆریۆس و ماستەرو دکتۆرادا.

ئەمڕۆ کار گەیشتۆتە ئەوەی چەندین ڕێکخراوو دامەزراوەی حکومی و ناحکومی و نێودەوڵەتی پێکهاتوون بۆ توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی بوارە هەمەلایەنەکانی ژیان و بڵاوکردنەوەی کتێب و نامیلکەی تایبەت بەنووسینی توێژینەوەی زانستی.

بەڵام ئەگەرچاوێك بەکتێبخانەی کوردیدا بخشێنین دەبینین لەم بوارەدا بەئەستەنگ کتێبێك بەرچاو دەکەوێت ڕێنیشاندەر بێت بەچۆنیەتی نووسین و ئامادەکردنی توێژینەوەی زانستی. هاوکات چەندەها کتێب و بڵاوکراوە هەن بە زمانە بیانیەکانی جیهان کە ڕێنیشاندەرن بۆ توێژەرو قوتابیانی ئاستە جیاجیاکانی زانکۆو خوێندنی باڵا لەسەر شێوازو چۆنیەتی ئامادەکردنی توێژینەوەی زانستی .

بۆیە بە پێویستمان زانی لەپێناو خزمەتکردن بە خەرمانی زانستی گەلەکەمان و وەك سەرەتا هەنگاوێك بۆ خزمەتکردن بە بواری لێکۆڵینەوەو

توێژینەوەی زانستی بەهێزو سودمەند هەستین بە وەرگێرانی ئەم کتێبە. بەو هیوایەی کەلێنێکی ئەم بوارە زانستیە پڕبکاتەوە.

پێویستە ئاماژەش بەوە بکەین کە وەرگێرانی ئەم کتێبە وەرگێڕانی دەقاودەق نیە بەڵکو بەپێی پێویست ێی زیادوکەم کراوە بەو پێودانگەی کە زمان هوکاریکە بۆ لەیەکتێ گەیشتن.

## ئەم کتێبە لەدوو بەشی سەرەکی پێکهاتووە:

**١.توێژینەوەی زانستی** (البحث العلمي): کەلەم بەشەدا باسی توێژینەوەی زانستی وجۆرو بنەماو هەنگاوەکانی و چۆنیەتی ڕیکخستن و نووسینی کراوە .

**٢.دەستنوسەکان**(المخطوطات): لەم بەشەدا پێناسەی دەستنووسەکان و مەرج و هەنگاوەکانی بەدواداچوونی باسکراوە .

# پێشەکی

## پێناسەی توێژینەوەی زانستی :

ئەم دەستەواژەیە لە دوو وشە پێك دێت : توێژینەوە . زانستی .

توێژینەوە لە ڕووی زمانەوانیەوە ماناکەی بریتی‌یە لە : داواکردن، گەڕان، پشکنین، گەیشتن بەوپەڕی ڕاستیەك لە ڕاستیەکان یان کارێك لە کارەکان .

بەڵام زانستی وشەیەکە دەگەڕێتەوە بۆ زانست، بەمانای زانیاری، پەی پێبردن و زانینی ڕاستیەکان. کەواتە زانست واتە ئاشنابوون بە ڕاستیەکان و ئەوەشی کە پەیوەندی پێوە هەیە .هەرچەندە زانست بنچینەکەی زانیاری‌یە لەگەڵ ئەوەشدا زانست فراوانترە .

زانست واتە ئاشنابوون بەڕاستی‌یە هەمەکی و ئاڵۆزەکان لەکاتێکدا زانیاری واتە شارەزابوون لەڕاستی‌یە لاوەکی و سادەکاندا .لێرەوە زانست بە کۆمەڵێك ڕاستی هەمەکی دەوترێت کەیەك ئاڕاستە کۆیان دەکاتەوە وەك زانستەکانی : گەردونزانی، ڕووەك زانی ، شوێنەوارناسی، هتد.

وەلەبەرئەوەی کە بابەتی توێژینەوەی زانستی لەبنەمادا لەسەر داواکردنی زانیاری و بەدواداگەڕانی و پەی پێبردنی بەندە ، ئەوا لەهەمان کاتدا هەموو زانستەکان دەگرێتەوە وەپشت بەشێوازو بەرنامەی هەمەجۆر دەبەستێت لەبەسەرکردنەوەو گەڕان بە دوای ڕاستی زانیاریەکانداو لێدوانی لە ڕاستی‌یە زانستی‌یەکان.

توێژەری زانستی لەبەسەرکردنەوەی ڕاستی‌یە زانستی‌یەکاندا دەیەوێت زیادە دروست بکات ، یان گۆڕانکاری نوێ لە بوارەکانی زانستدا بهێنێتەکایەوە، بە پشت بەستن بەم شیکردنەوە کورتە دەکرێت پێناسەی

توێژینـەوەی زانسـتی بکـەین بـەوەی کـە (بەسـەرکردنەوەو پـەی پێبردنـی ڕێکخراوی ڕاستی‌یە زانستی‌یەکانە، بەرەچاوکردنی شێوازو بەرنامەی زانستی دیاریکراو، بەمەبەستی دڵنیابوون لەڕاستی و دروسـتی‌یەکەی یـان گـۆڕینی یان زیادکردنی تازە بۆی).

وەبەسەرکردنەوەی بەرنامەداری ڕاستی‌یە زانستی‌یەکان واتە توێژینەوەو بە دواداچوونی قووڵ و نوقم بوون لە دەریای بیرکردنەوەداو لێـدوان لـە مانـا نزیـك و دوورەکـان، وە بـۆ هـەموو لقـەکانی زانسـتە مرۆڤایەتیـەکان و زانستەکان بـە هـەموو جۆرەکانیانـەوە، تیۆریـەکان وەك : زانسـتی زمـان و زانستی کۆمەڵایەتی و ئـەدەب و ئـابوری و فەلسـەفە.....تـاد، وە زانسـتە کرداریـــەکان وەك: زینـــدەوەرزانی ، ماتماتیـــك، فیزیـــا، ئەنـــدازیاری، پزیشکی...تاد .

# باسی یەکەم

## دامەزراوەکانی توێژینەوەی زانستی

### دامەزراوەکانی توێژینەوەی زانستی پێکهاتوون لە:

١- دامەزراوەکانی زانکۆ.

٢- دامەزراوە زانستییە حکومیەکان.

٣- دامەزراوە زانستییە ئابوریەکان.

٤- دامەزراوە زانستییە خێرخوازیەکان.

### دامەزراوەکانی زانکۆ:

زانکۆکان بە ژینگەیەکی زانستی گونجاو لەقەڵەم دەدرێن بۆ ئامادەکردنی توێژینەوە، چونکە زانکۆ درێژەپێدەری قۆناغە زانستییەکانی پێشووە کە زۆرێك لەتوێژەرو کەسانی بەتواناو خاوەن بەهرەی لێوە دەردەچێت، کەتوانای زانستی و زرنگی و هۆشمەندییان ئامادەو شیاویان دەکات بۆ گەیشتن یان پەیوەندیکردن بە خوێندنی باڵاوە(پسپۆڕیەوە) لەزانکۆکانداو دواتر ئامادەکردنی توێژینەوەی زانستی ، بەڕەچاوکردنی ئەوەی کە دەرچووانی زانکۆکان گرۆیەکی هەڵبژێردراون لەو زانستخوازانەی کە بەرپرسیاری بوژاندنەوەی ئاستی فکری کۆمەڵگاو پاککردنەوەی خواستی گشتیو بەرزکردنەوەی بیری زانستیو بەرزڕاگرتنی ئاستەکانی زانست، وە دواتر نوێکردنەوەی زانست و زانیاریەکان بەدۆزینەوەی نوێ و بڵاوکردنەوەی بۆ سودگەیاندن بە هەمووان لەئەستۆی ئەواندایە.

دەبێت ئەوەش بڵێین کە ئامادەکردنی نامەی زانکۆ بەکۆکردنەوەی هەردوو ئامانجی فێرکردن و توێژینەوەی زانستی تەواو دەبێت .بەشێوەیەك کە

نابێت گرنگیدان و ئەركی زانكۆكان تەنها لەبەر هەمهێنانی خوێندەوارو پیشەیی‌یەكاندا قەتیس بكرێت ، هەروەك ناشگونجێت كە تەنها ئیشی ئامادەكردنی توێژینەوەی زانستی و بەرهەمهێنانی توێژەرانی زانستی بێت لێرەوە ئەم پێویستی‌یە پتەوكردنی پەیوەندی نێوان زانكۆكان و دامەزراوە تایبەتەكانی توێژینەوەی زانستی دەخوازێت .

*دامەزراوەكانی تری وەك:

- دامەزراوە زانستی‌یە حكومیەكان.
- دامەزراوە زانستی‌یە ئابوریەكان.
- دامەزراوە زانستی‌یە خێرخوازیەكان.[1]

---

1- بۆ ناسی دامەزراوەكانی تر خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە عەرەبی‌یەكە.

# باسی دووەم

## جۆرەکانی توێژینەوەی زانستی

### جۆرەکانی توێژینەوەی زانستی:

توێژینەوە زانستی‌یەکان جۆراوجۆرن بە پێی پێوەرەکانی :مەبەست ، سنور (چێوە) و پسپۆڕی .

### پێوەری یەکەم:

**مەبەستی توێژینەوەکە** : بە پێی ئەم پێوەرە توێژینەوەی زانستی دابەش دەبێت بۆ دوو جۆر: توێژینەوەی زانستی تیۆری ، توێژینەوەی زانستی پڕاکتیکی.

**جۆری یەکەم : توێژینەوەی زانستی تیۆری**:-

که مەبەست لێی گەیشتنە بەزانیاری تەنها لەپێناو خودی زانیاریدا بەبێ ئەوەی کە ئامانجێکی کرداری لەئارادابێت هەروەك توێژینەوەی زانستی تیۆری، توێژەر تەنها بۆ پەیبردن بەڕاستیەکی زانستی پێی هەڵدەسێت ، بەبێ ڕوانین لەبەجێهێنانی زانستی بۆی .

وەمەبەستی توێژینەوەی تیۆری تەنها خۆی لەگەیشتن بە زانیاری ڕاستەقینەدا دەبینێتەوە ، بۆ تێرکردنی سروشتی حەزی ئاگایی و هۆشیاری و خواستی زانستی. توێژەری زانستی لە ئامادەکردنیدا بۆ توێژینەوەی تیۆری ،هەرگیز گرنگی نادات بەبەجێهێنانەکانی.کارەکانی ڕۆژانەی .بەشێوەیەکی گشتی توێژینەوەی زانستی تیۆری لەو بابەت و بیرۆکە زانستی و ئەدەبی‌و کۆمەڵایەتیانە دەدوێت کەبەزانستە مرۆڤایەتیەکان ناودەبرێن وەك :

زانستەكانی زمان و ڕێزمـان و ئـەدەب و مێـژوو جوگرافیـاو كۆمەڵناسـیو لۆژیك و فەلسەفەو دین .....تاد.

وەهەموو ئەو زانستانەی كە ئامادەكردنی توێژینەوە لە بابەتەكانیدا سـودو كەڵكی تیۆری ئاشكرا بەدیدەهێنێت ، نەك سودی كرداری ، وەك ئەنجامدانی لێكۆڵینـەوە دەربـارەی ئـەو هۆكارانـەی كـە كاریگـەربوون لەسـەر ژیـانی شاعیرێك ، ئەدیبێك یان سـەرۆكی دەوڵـەتێك یـان فەیلەسـوفێك ، تـەنها سودێكی ئەدەبی یان مێژوویی تیۆریمان پێشكەش دەكات.

**جۆری دووەم : توێژینەوەی زانستیی پراكتیكی:-**

مەبەست لێی گەیشتنە بە زانیاری نەك تەنها بە مانایەكی دیاریكراو بۆی و لە پێناویدا، بەڵكو بۆ بەدیهێنان و داهێنانی چارەسەرێكی دیاریكراوو پەسەند بـۆ ئـەو كێشـانەی كـە بـەلای كۆمەڵگـەوە گـرنگن و دوچـاریان بـووە . لەوانەش : كێشەكانی بەرهەمهێنان و داهێنراوەكـان و خزمەتگوزاریـەكان ، وە ئەوانەشی كـە لـە چارەسـەركردنیاندا بەشـداری دەكـەن بـۆ بـەدیهێنانی مەبەسـتەكانی كۆمەڵگــە لــە پێشــكەوتنی بەرهــەمهێنان و چــاككردنی پێویستیەكانیدا.

بە دەربڕینێكی تر توێژینەوەی زانستی مەبەسـتی فەراهـەمهێنانی دۆزراوەو داهێنراوە زانستیە نوێیەكانە ، هەروەك توێژینـەوەی زانسـتی پێشـكەوتوو درێژەپێـدەری زیـادكردنی بەرهـەم و چـاككردنی ئامرازەكانیـەتی بـە بـەكارهێنانی هۆكـارە تەكنیكیـە تازەكـان لـە كەمكردنـەوەی خـەرجی و تێچونەكاندا ، لەبەرامبەر زیادبوونی بەرهەم و ئاستەكانی خزمەتگوزاریدا كـە دەرەنجام دەبێتە هۆی زیادبوونی قازانج و پێشكەوتنی زانستی خوازراو .

وەوشەی تەکنەلۆژیا لە توێژینەوەی زانستی پراکتیکی‌یەوە دروستبووە . بەمانای بە جێهێنانی زانستی بۆ بەرهەمەکانی پێشکەوتنی زانستی لە وەبەرهێنانی کالآی بەسود بۆ کۆمەڵگە .

هەروەك وشەی تەکنەلۆژیا واتە شارەزایی ڕێکخراو بە هونەرە پیشەسازیەکان و بەجێهێنانی زانستە تیۆریەکان و تەرخانکردنی لەکارگەکاندا: بۆ هێنانەکایەی شتی کرداری و هەستپێکراو.

دەبێت ئەوەش لەیادنەکەین کە هەردوو جۆری توێژینەوەی زانستی: تیۆری و پرکتیکی بەتەواوی لەیەك جیاناکرێنەوە بەهۆی ئەو پەیوەندیەی کە لەنێوانیاندایە. هەروەك توێژینەوەی پرکتیکی سودە خوازراوەکانی نایەتەدی بە پاڵپشتی توێژینەوەی زانستی تیۆری نەبێت، وەهەروەها توێژینەوەی زانستیی تیۆریش.

**پێوەری دووەم :**

**سنوری توێژینەوەکە:**

بە پێی ئەم پێوەرە توێژینەوەی زانستی دابەش دەکرێت بە دوو جۆرەوە : توێژینەوەی زانستی بنچینەیی و توێژینەوەی زانستی کرداری .

**جۆری یەکەم : توێژینەوەی زانستی بنچینەیی**: مەبەست لێی گەیشتنە بە زانیاری گشتی . واتە بە چارەسەری گشتی بۆ کێشەیەکی دیاریکراو لەچوارچێوەیەکی دیاریکراودا ، ئەویش بە لێکۆڵینەوەی لەمیانەی ئەو مەیدانە زانستی‌یەی کە ئەو کێشەیەی بۆدەگەڕێتەوە .

وە مەودایەك لەمەوداكانی زانیاری دیاریكراو چوارچێوەی توێژینەوەی بنچینەیی پێكدەهێنێت : وەك بواری پەروەردەیی یان مێژوویی ، ئەمەش لەمیانەی بارودۆخی دیاریكراوی توێژەردا .

**جۆری دووەم : توێژینەوەی زانستیی كرداری:**

مەبەست لێی گەیشتنە بە زانیاریەكی تایبەتی ناوخۆیی ، لە چوارچێوەیەكی تایبەتدا كە پەیوەندی بە كێشەیەكی تایبەتەوە هەیە لە كات و شوێنی دیاریكراودا . وەتایبەتمەندێتی توێژینەوەكە رێگرە لەبەردەم دروستكردنی هەر بارودۆخێكی نوێدا . بەڵكو توێژەر لە توێژینەوەكەیدا پابەندە بەو بارودۆخەی كەلەئارادایە وە لەهەمان كاتدا ئەو دەرئەنجامانە بەكارناهێنێت كە پێی گەیشتووە لەسەر ئاستی گشتی توێژینەوەكە نەبێت .

**پێوەری سێیەم :**

**تایبەتمەندی توێژینەوەكە:**

بەپێی ئەم پێوەرە توێژینەوەی زانستی دابەش دەبێت بۆ سێ جۆر: توێژینەوەی پۆلی ، توێژینەوەی ماستەر ، توێژینەوەی دكتۆرا.

**جۆری یەكەم : توێژینەوەی پۆلی:**

ئەم جۆرە لە توێژینەوە لەكاتی خوێندن لە پۆلدا ئامادە دەكرێت ، واتە لە میانەی سالانی خوێندنی زانكۆدا جا لە كۆلێژە زانستی یان ئەدەبیەكان بێت . كە ئەویش مەبەست لێی راهێنانی قوتابی زانكۆیە لەسەر چۆنیەتی ئامادەكردنی توێژینەوە : وەك سەرەتایەك بۆ ئامادەكردنی توێژینەوەكانی ماستەرو دكتۆرا.بۆیە دامەزراوەی زانكۆكان جەخت دەكەنەوە لەسەر

خوێندنی وانەی ڕێبازی توێژینەوە یان زنجیرەیەك توێژینەوە لە کاتی خوێندنی زانکۆدا .

مەبەست لە توێژینەوەی پۆلی ڕاهێنانی قوتابی زانکۆیە لەسەر ئامادەکردنی توێژینەوەو پاشان گەشەپێدانی بەهرەکانی و فراوانکردنی زانین و ڕێکخستنی بیروڕاو دەربڕینی ئەو بیرۆکەو ئەندێشانەی کە لە بیروهۆشی دا دێت و دەچێت ، بەشێوازێکی زمانەوانی باش لە ڕووی وشەی هەڵبژێردراو یان ڕستە یان دەربڕین یان زاراوە یان ڕەوانبێژی یەوە بێت .

وە لەبەرئەوەی ئەم جۆرە توێژینەوەیە بۆڕاهێنانە ئەوا مەرج نی یە نمونەیی بێت ، هەر بۆیە نرخی زانستی بوونی توێژینەوەکە لەوەدا دێتەدی کە توێژەر ڕەچاوی بنەماو بەجێهێنان و هەنگاوەکانی ئامادەکردنی توێژینەوەکە بکات ، پاشان ئەو ڕێنمایی و ئامۆژگاریانەی کە پێی دراوە جێبەجێی بکات.ژمارەی لاپەڕەکانی ئەم جۆرە توێژینەوەیە لەنێوان ٥٠- ١٠٠ لاپەڕەدایە .

## جۆری دووەم : توێژینەوەی ماستەر:

توێژینەوەیەکی پسپۆڕی یەو پلەی لە توێژینەوەی پۆلی بەرزترە . بۆئامادەکردنی وەم جۆرە لەتوێژینەوە پێویستە توێژەر بڕوانامەی خوێندنی زانکۆی بەدەست هێنابێت .

توێژینەوەی ماستەر بە توێژینەوەیەکی پسپۆڕی دادەنرێت . کەمەبەستی هێنانەدی نوێگەری یە لەزانیاری ڕۆشنبیری و زانستەکان و ڕاهێنانی توێژەر بۆ بەدەستهێنانی ئەزموون لەچوارچێوەیەکی وردترو فراوانتر لەئامادەکردن و بەدواداچووندا بۆیە توێژینەوەی ماستەر تاقیکردنەوەی زیرەکی و توانایی توێژەرو ئامادەگیەکانی یەتی لەسەر درێژەپێدانی توێژینەوەو دانان و

بەدواداچوون و دواتر هێنانەکایەی داهێنراوێکی نوێ ، وەك سەرەتایەك بۆ ئامادەکردنی توێژینەوەی دکتۆرا. هەروەك دەکرێت توێژینەوەی ماستەر نوسین بێت لە بابەتێکی نوێدا یان بە دواداچوونی دەستنوسێك بێت.

زۆربەی زانکۆکان بۆ تۆمارکردنی توێژینەوەی ماستەر بەمەرجی دادەنێن کە قوتابی زانکۆ لەبڕوانامەکەیدا هەڵسەنگاندنی لە پلەی زۆرباش کەمتر نەبێت . ژمارەی لاپەڕەکانی توێژینەوەی ماستەر ٢٠٠ لاپەڕەیە.

## جۆری سێیەم : توێژینەوەی دکتۆرا :

بەرزترین توێژینەوەی پسپۆڕی و لوتکەی توێژینەوە زانستییەکانە . بەمەبەستی نوێکاری چەسپاوو ڕیشەیی لە مەیدانی زانستەکاندا ، کە دەتوانێت کتێبخانە دەوڵەمەند بکات بە بیرۆکەی نوێ و بیردۆزی داهێنراوی زانستی .

وە مەبەستە بەرزەکەی خۆی لە دروستکردنی کەسێتیەکی زانستی ڕاستەقینەو جیاکاردا دەبینێتەوە . تاوەك سەرچاوەیەکی زانستی پشتی پێببەسترێت .کە بەرپرسیاریتی بەشداریکردن لەبوژاندنەوەی زانستی کۆمەڵگەکەیدا لەئەستۆدەگرێت لەچوارچێوەی پسپۆڕیەکەیدا .

دەکرێت توێژینەوەی دکتۆرا نوسین بێت لە بابەتێکی نوێی داهێنراودا یان بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەی دەستنوسێك بێت . وە ژمارەی لاپەڕەکانی توێژینەوەی دکتۆرا لە ٥٠٠ لاپەڕەدا خۆی دەبینێتەوە .

ئێستاش ئاراستەی نوێ لەزانکۆکاندا بریتییە لەکەمکردنەوەی ژمارەی لاپەڕەکانی توێژینەوەی ماستەر بۆ ١٠٠-١٥٠ لاپەڕەو توێژینەوەی دکتۆرا بۆ ٣٠٠ لاپەڕە .

توێژینەوەی ماستەرو دکتۆرا لەگەڵ بڕوانامەی زانکۆدا ( لیسانس یان بەکالۆریوس ) لە ڕژێمی ئەوەدا هاوشێوەن کە ئەوانیش : ( پەسەند و باش و زۆرباش و بالاّ ) ن .

ئەوەی پێویستە لێرەدا ئاماژەی پێبکرێت : ئەوەیە کە نازناوی ( دکتۆر) بەیەکێك دەبەخشرێت کە توێژینەوەیەکی لەبابەتێکی دیاریکراودا ئامادەکردبێت و لەبەردەم لیژنەیەکی پێکهێنراوی زانکۆدا پێشکەشی کردبێت. هەروەك پێویستە ئەندامانی لیژنەکە پلەی دکتۆرایان بەدەست هێنابێت و لەهەمان کاتدا لە بواری وانەوتنەوەو نوسین و ئامادەکردن و بلاّوکردنەوەی توێژینەوەدا دەستێکی بالاّیان هەبێت .

## جۆرەکانی تری توێژینەوە:

**١- ڕاپۆرت:** بریتیە لەکۆکردنەوەی چەند ڕاستی یەك یان ڕاسپاردەیەکی دیاریکراو بەمەبەستی بلاّوکردنەوەو ڕاگەیاندنی بەخەڵك. چونکە ڕاپۆرت بەدوای ئەو پرسیارو ڕاسپاردانەدا ئەچێ کە لەکۆنگرەیەکی زانستیدا بڕیاری لەسەردراوە.

**٢- وتار:** مەبەست لە وتار خستنەڕووی زانیاری کۆنە وە بەمانای وشە بەتوێژینەوە لەقەڵەم نادرێت و هیچ زانیاریەکی نوێ نابەخشێتە خوێنەر، نوسەری وتار پابەند نابێت بە بنەماکانی توێژینەوەوە وەك : دابەشکردنی بۆ پێشەکی و بەش و باس و کۆتایی و پێرستی سەرچاوەکان ،یان ئاماژەکردن بە دەقی وەرگیراو.

بەڵکو وتار تەنها ڕای نووسەر ئەخاتەڕوو ،ئەویش بەتۆمارکردنی تێبینـی و لێکدانەوەکانی بەشێوازێك خواستی خوێنەر بورووژێنیۆ سـەرنجی بـەلای ڕای خۆیدا ڕابکێشیٚ.

ئەمـەش بەپێچـەوانەی توێژینـەوەی زانسـتی یـەوە کـە ئامـانج لێـی ڕوونکردنەوەی کێشەی زانستی و ڕاستی داواکراوە، بەشـێوەیەکی بابەتیانـە وێڕای خستنەڕووی زانیاری نویٚ.

# باسی سێیەم

## بنەماکانی توێژینەوەی زانستی

### بنەماکانی توێژینەوەی زانستی :

تاڕادەیەکی زۆر گرنگی توێژینەوەی زانستی پەیوەستە بە دیاریکردنی بنەما ئەدەبی‌یەکانەوە ، لەوانەش :

١ - دیاریکردنی کێشەی توێژینەوەکە.

٢ - نوێکاری و داهێنانکاری.

٣ - زیادکردنی زانیاری نوێ.

٤ - گرنگی توێژینەوەکە.

٥ - ڕەسەنێتی توێژینەوەکە.

٦ - گونجاوی توێژینەوەکە.

٧ - سەربەخۆیی توێژینەوەکە.

٨ - فرەیی سەرچاوەکانی توێژینەوەکە.

### ١- دیاریکردنی کێشەی توێژینەوەکە :

کێشەی توێژینەوەکە واتە : بابەت و کێشەو بوارو بیرۆکەکانی توێژینەوە زانستی‌یەکە . کە ئەمیش یەکێکە لەبنەما بنچینەیی‌یەکانی توێژینەوە، دیاریکردنی کێشەی توێژینەوە ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لەڕوونکردنەوەو خستنەڕووی گرنگی توێژینەوەکەو ئەو گریمانانەی کە پشتی پێدەبەستێت و جۆری زانیاری و هۆکارو نمونەو تاقیکردنەوەو شێوازو جۆرەکانی ئەو بەرنامە زانستیانەی کە پشتیان پێ دەبەسترێت لەئامادەکردنی توێژینەوەکەدا .وە دیاریکردنی کێشەی توێژینەوە لەسەر چەند هۆکارێك بەندە لەوانە :

ا - **جۆری زانستەکە**: واتە جۆری زانیاری و بواری زانستی بابەتی توێژینەوەکە . هەروەك بوارەکانی زانست و زانیاری زۆرێك لەو کێشانە دەوروژێنێت کە پێویستە بنە بواری توێژینەوەو بەدواداچوون .هەروەها بەدەستهێنراوە هەمەجۆرەکان لە بوارەکانی زانیاری و زانستە مرۆڤایەتیەکاندا زۆرێك لە زانیاری و راستی زانستی و سەرەنجام زۆر کێشە لە مەیدانە جیاوازەکانی زانستدا دەوروژێنێت .پاشان جۆری زانست یان زانیاری تارادەیەکی زۆر یارمەتیدەرە لە دیاریکردنی جۆری کێشەی دیراسەکراو .

ب - **پسپۆری زانستی**: بریتی یە لە شارەزایی و پەیبردن بە کێشەکانی توێژینەوەکە.توێژەری پسپۆر دەتوانێت تێبینی زۆر کێشەی چارەسەرنەکراو بکات . وە لە دەرگای زۆر بواری زانستی فەرامۆشکراو بدات و دەستی لەسەر زۆر بابەت وبیرۆکەی نوێ دابنێت .

ج - **خواستی زانستی**: ئەمیش خواستی ئاگایی و لێکۆڵینەوە لەو بنەمایانەی کە حەزی بەدواداچوون و شارەزابوون دەوروژێنێت و توێژەر هان دەدات بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەیەکی زانستی دیاریکراو ، و دواتر هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی چارەسەر .

ڕەنگە کێشە لە توێژینەوەکەدا بریتی بێت لە تێبینی یە مەیدانی یەکانی توێژەرو ئەزمونەکانی رۆژانەی ، لێرەدا خواست و گرنگیدانی سەربەخۆی خۆی پاڵی پێوە دەنێت بۆ هەوڵدانی ڕاستەقینە لەپێناو دۆزینەوەی چارەسەر بۆ ئەو کێشانەی کە لێوەی دروستبووە ، بۆنمونە : یاسای تاقیکردنەوەکان ، وەئایا پێوەرێکی دروستە بۆ ڕاستکردنەوەی قوتابی ؟ یان شێوازو پرۆگرامی پەیرەوکراوی خوێندن گونجاوو شیاوە بۆ گەیاندنی زانیاریەکان ؟.

د - **ئامانجی زانستی**: بریتی‌یە لە خواستی توێژەر بۆ گەیشتن بە تیۆرێکی زانستی نوێ یان یاسایەکی نوێ یان داهێنانێکی نوێ کە دەکرێت خودی توێژەر یان کەسانی تر سودی لێوەربگرن لە بواری وانەوتنەوەدا . یان گەیشتن بە تیۆر یان یاسایەك کە سودی لێوەربگیرێت لەوەبەرهێنانی تواناکاندا...تاد.

ه - **بابەتی زانستی**: بڕو جۆری بابەتە زانستیەکە بەشداری دەکات لە دیاریکردنی کێشەی توێژینەوەکە . چەندە قەبارەی بابەتە زانستی‌یەکە کەمتر بێت ، هێندە ئەو بیرۆکەو کێشانەی کە دەیوروژێنێت کەمتر دەبێت و هەلی زیاتر دەرەخسێت لە دیاریکردنی کێشە لە توێژینەوەکەداو دۆزینەوەی چارەسەر بۆی .هەروەك چەندێك جۆری بابەتە زانستی‌یەکە دیاریکراو بێت و کێشەو مەبەستە خوازراوەکانی ناسراو بێت ئەوەندە بوار والا دەبێت بۆ دانانی چارەسەر بۆ کێشەکان.

### ٢ - نوێکاری و داهێنانکاری:

لە بنەما بنچینەیی‌یەکانی توێژینەوە ، ئەوەیە کە نوێ و داهێنراو بێت و زانیاری نوێ زیاد بکات واتە گواستراوە یان لاسایی یان وەرگێران یان دووبارە نەبێت .هەروەك نوێکاری لە توێژینەوەدا ئەوە ناگەیەنیت کە توێژینەوەکە لەوەوبێش باس نەکرابێت . بەڵکو بەو مانایەی کە لێکۆڵینەوەکە لە بەشێکی زانستی یان بیرۆکەیەك یان لە کێشەیەکی زانستی پەیوەست بە توێژینەوەکە بدوێت .کە پێشتر باس نەکرابێت ، لە کاتێکدا زۆربەی ئەو توێژینەوانەی کە ئەنجام دراون توێژەر زۆرێك لە کێشە دەدۆزێتەوە تیایاندا . هەروەها نوێکاری لە توێژینەوەدا چەند شتێکی تر

دەگرێتەوە : وەك ڕێكخستنی بابەتە باسكراوەكەو بەشەكانی بە شێوازێكی نوێ یان وەك پەیبردن بە هۆكاری نوێ بۆ ڕاستیيە كۆنەكان و بواری نوێ بۆ ئەو بیردۆزانەی كەلە ئارادان .

٣ - **زیادكردنی زانیاری نوێ** : بەندە لەسەر جۆری كێشەی توێژینەوەكە . چونكە توێژینەوەی وا هەیە كە زۆرێك لە كێشەو بابەتی جۆراوجۆر دەوروژێنێت لە كاتێكدا كە چارەسەرەكانیان فەراهەم هاتووە .

لێرەوە هەموو توێژینەوەیەك شایەنی هەوڵدان و بەدواداچوون نیيە هەرچەندە ڕەگەزەكانی نوێكاری و داهێنانكاری تیادا هاتبێتەدی. وە پێویستە توێژەر لەڕاستی ڕەگەزی توێژینەوەكەی بكۆڵێتەوەو بپرسێت كە ئایا چی نوێی هەیە بۆ مەیدانەكانی زانست . لەمەشدا هەردوو بواری زانستی تیۆری و پراكتیكی یەكسانن .

٤ - **گرنگی توێژینەوەكە** : ئەمەش جێبەجێ دەبێت بەسەر توێژینەوەو توێژەردا بەیەكسانی .

هەروەك ڕاست و بەجێیی توێژینەوە لەگرنگی توێژینەوەكە خۆی و گرنگی ئەو كێشانەی كە دەیوروژێنێت و ئەو بابەتانەی كە لێی دەدوێت وە ئەو بوارانەی كە دەیگرێتەوە سەرچاوە دەگرێت .

وەهەروەها گرنگی توێژینەوە پەیوەستە بە گرنگیدانی خودی توێژەر بە توێژینەوەكەو ئەندازەی گەرم و گوڕی وهەوڵدانی . هەروەك پێویستە توێژینەوەكە لەبابەت گەلێك دا بێت كە لەڕووی زانستیيەوە گرنگی هەبێت.

## ٥ - ڕەسەنی توێژینەوەکە :

ئەمەش لەبنەما بنچینەیی یەکانی توێژینەوەیەو لەڕاستی و بەجێیی بەشداری یە هەمەجۆرەکان لەبوارەکانی زانستە مرۆڤایەتیەکاندا گەلاڵە دەبێت ، وە توێژینەوە لەڕەسەنی و سەربەخۆیی بیرۆکەکاندا بنیات دەنرێت ، هەروەك توێژینەوەی ڕەسەن پشت بە بیرۆکەی نوێ و ڕای تازە دەبەستێت ، نەك تەنها گێڕانەوەی ڕاوبۆچوونی توێژەرانی تر بێت لە قالبی تازەدا یان کورتکردنەوەی ، بەلام توێژەر بۆی هەیە کە پشت بە ڕاوبۆچوون و پوختەی توێژینەوەی کەسانی تر ببەستێت ، وێڕای سودوەرگرتن لە لێکۆلینەوەو تێبینی پەیوەست بەبابەتێکی دیاریکراوو دەرئەنجامەکانی لە دروستکردنی بیرۆکەی تایبەت و دارشتنی گریمانەی زانستی و خستنەڕووی ئەو بەلگەو ڕونکردنەوانەی کە پالپشتی بیرۆکەو چارەسەرو تێڕوانینەکانی دەکات سەبارەت بە بابەتی توێژینەوەکە . هەروەها ڕەسەنی توێژینەوەکە بەندە لەسەر خودی بابەتی توێژینەوەکە، بەوەی کە چەندە نوێو داهێنراوبێت و خاوەنی نرخی زانستی بێت و پەیوەست بێت بە گرنگیدانەکانی کۆمەلگاوە لەزانیاری و گریمانەو کێشەو چارەسەرەکانی و شایەنی کۆشش و هەولدان بێت، ئەوا هێندە توێژینەوەیەکی ڕەسەن دەبێت .

### ٦ - گونجاوی توێژینەوەکە:

واتە ڕۆنەچوون لەبابەتی ئالۆزو شاراوەو لقداردا کە لەسەروو توانای توێژەرەوەیە لە توێژینەوەکەدا، لێرەوە پێویستە توێژەر پەرە بە توانا زانستییەکانی بدات و لە خۆی بپرسێت کە ئایا لە توانایدایە توێژینەوە ئامادە بکات ؟

چونکە هەنگاوی نارێك و سەرپێی و حەزی کوێرانە بۆ توێژینەوە لە بابەتێکدا ، ڕەنگە لەو ئاستەدا نەگونجێت لەگەڵ قەبارەی ئەو کێشانەی کە پەیوەستن بە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەکەوە. هەروەك زۆر بابەت و توێژینەوەی سەرنج ڕاکێش هەن کە توێژینەوە لەبارەیانەوە ئاسان نی یە، ئەویش یان بەهۆی کەم و کورتی هۆکارە مادی و مەعنەویەکانی توێژینەوەکە یان بە هۆی ئالۆزی و لقداری یان گەورەیی کێشەکانیەوە .

وە هەروەها گونجاوی و دەستدانی توێژینەوەکە بەندە لەسەر توانای توێژەر لە دیاریکردنی مانا و زاراوە بەکارهاتووەکان لە دارشتنی توێژینەوەکەدا .

### ٧ - سەربەخۆیی توێژینەوەکە:

توێژەر لە هەموو کەس لەپێشترەو مافی خۆیەتی کە سەربەخۆ بێت لەئامادەکردنی توێژینەوەکەیدا. ئەمەش بنەمایەکی ڕەوشتییە کە ئەندازەی پابەندبوونی توێژەر بە بنەماکانی بابەتیبوونی زانستی و بنەماکانی ڕەفتاری ئەدەبی لە ئامادەکردندا دەردەخات .

هەروەك بنەماکانی ڕەوشتی زانستی پێویستی بەسەربەخۆیی توێژەر هەیە لەهەربابەتێك یان توێژینەوەیەك کەمافی پێشینەیی هەیە لە ئامادەکردنیدا ، بەبێ پێشێلکردنی مافی کەسانی تر. لێرەوە دامەزراوەکانی زانکۆ سورن لەسەر پشتگیری کردنی ئەم بنەمایەو توێژەران قەدەغە دەکەن لە

پێشـێلکاری و توێژینـەوە ئەنجامـدان لـە بابـەت گـەلێك دا کـە پێشـتر توێژینەوەیان لەبارەوەکراوە، ئەویش بەبڵاوکردنەوەی ناوی کەسانی توێژەرو توێژینەوە تومارکراوەکانیان لە بلاوکراوەی خولیی تایبەتدا . لەهەمان کاتدا زۆر دەقی یاسایی هەیەلەسەر سزای پێشێل کردنی مافی کەسانی تر لە نوسین و توێژینەوەدا ، کە ( بەمافی ئەدەبی بۆ توێژینەوەی زانستی ) دەناسرێت.

**٨ - فرەیی سەرچاوەکانی توێژینەوەکە :**

فرەیی و دابین بـوونی سەرچـاوەکانی توێژینـەوە کـارێکی زۆر پێویسـتە، چونکە بەبێ سەرچاوە توێـژەر ناتوانێـت سـەرکەوتووبێت لـە ئامـادەکردنی توێژینەوەکەیدا وە پێویستە لەسەر توێژەر لەو توێژینەوانە دووربکەوێتـەوە کـە سەرچاوەی کەمیان هەیە. وەهەروەها ئەو بابەتە ئاڵۆزانـەی کـە دیـاریکردنی سەرچاوەی پەیوەندیدار پێوەی کارێکی قورسە . وشەی سەرچاوە واتە کتێبی کۆن و نوێ و دەستنوس و بلاوکراوەی خولیی وەك گۆڤارو ڕۆژنامەو کتێبی وەرگێردراوو... هتد.

# باسی چوارەم

## هەنگاوەكانی ئامادەكردنی توێژینەوەی زانستی

**هەنگاوەكانی ئامادەكردنی توێژینەوەی زانستی:** ئامادەكردنی توێژینەوەی زانستی پێویستی بەچەند هەنگاوێك هەیە لەوانە:

١ – هەڵبژاردنی بابەتی توێژینەوەكە .

٢ – ئامادەكردنی پلانی توێژینەوەكە .

٣ – كۆكردنەوەی سەرچاوە .

٤ – كۆكردنەوەی مادەی زانستی.

٥ – دارشتنی توێژینەوەكە.

٦ – پێرستكردنی سەرچاوەكان.

**هەنگاوی یەكەم - هەڵبژاردنی بابەتی توێژینەوەكە:**

گرنگترین هەنگاوی ئامادەكردنی توێژینەوەیەو توێژەر ناتوانێت بەهەنگاوەكانی تری توێژینەوەكە هەڵبستێت تا ئەم هەنگاوەی لا روون نەبێت . وە ئەم هەنگاوە رەنگە قورس دەربكەوێت بەهۆی گرنگیەكەیەوەو بەوپێیەی كە زۆربەی بابەتە زانستیەیە تیۆری و كرداریەكان توێژینەوەیان لەبارەوەكراوە یان پێكهاتەكانی ئاشكرانین و لقدارو ئالۆزن . بەلام بەپێچەوانەی ئەمەوە ئەو بابەت و حاڵەتە زانستیانەی كە توێژینەوەیان لەسەرنەكراوەو ئاشكران ژمارەیان زۆرە .

**ڕێگەکانی هەڵبـژاردنی بابـەتی توێژینەوەکـە کـورت دەکرێنـەوە لـە دوو ڕێگەدا:**

١ - هەڵبژاردنی بابەتەکە لەلایەن توێژەرەوە .

٢ - هەڵبژاردنی بابەتەکە لەلایەن مامۆستای سەرپەرشتیارەوە .

## ١ - هەڵبژاردنی بابەتەکە لەلایەن توێژەرەوە:

ئەمەش باشترین ڕێگەو نمونەییترین شێوازە لە هەڵبژاردندا . توێژەر خۆی خاوەنی توێژینەوەکەیەتی و تایبەتمەندە لە بابەتەکەیداو زاڵە بەسـەر پێکهاتـەو بەشەکانیداو خواستی بەرچاوی هەیە بۆ نوسین لەبارەیەوە.

هەڵبژاردنی بابەتی توێژینەوە بەزۆری لە میانەی ماوەی خوێندنی زانکـۆدا دەبێـت ، بـە پاڵپشـتی خوێندنـەوەی چـڕوپڕی توێـژەر .بەشـێوەیەك کـە شارەزاییەکی زانستی هەبێت دەربارەی بابەتەکـەی و پێکهاتـەکانی ، پاشـان ژمارەیەك بابەت هەڵبژێرێت بۆ توێژینەوەی ماستەرو دکتۆرا ، بۆئەوەی کاتی تەواوی هەبێت بۆ پالاوتنیـان ، هەرچـەندە هەڵنەبـژاردنی بابـەتی توێژینـەوە لەلایەن توێژەرەوە لەکاتی خوێندنی زانکۆدا مانای بێ توانایی و بێ دەسەلاتی توێژەر ناگەیەنێت .

هەروەك پەلەکردن لە هەڵبژاردنی بابەتی توێژینەوەدا دەبێتە هۆی ئـەوەی کە بابەتێکی نەخوازراو هەڵبژێردرێت و دواجار توێژینەوەکە گرنگـی خـۆی لەدەست بدات و توێژەر بخاتە تەنگ و چـەڵەمەیەکەوە کـە دەرچـوون لێـی ئەسـتەم بێـت ، مەگـەر لەسـەر هـەوڵ و توانـایی کـاتی و لێوەشـاوەیی یە زانستی یەکانی خۆی قەرەبوی بکاتەوە .

## ٢ - هەڵبــژاردنی بابــەتی توێژینەوەکــە لەلایــەن مامۆســتای سەرپەرشتیارەوە:

ئەم شێوازە گونجاوە سەبارەت بە زۆرێك لە توێژەران و ئەوانەی کە کات و توانا زانستی‌یەکانیان یارمەتیان نادات لــە هەڵبــژاردنی بابەتێکــدا لــەکاتی خوێندنی زانکۆ یان دوای خوێندن .

وەمــەرج نی‌یــە ئــەم شــێوازە رێگــر بێــت لەبــەردەم هەڵبژاردنی‌راســت ودروست دا ، بە پێچەوانەوە رەنگە مامۆستای سەرپەرشتیار ژمارەیەك بابەتی گرنگ و شیاوی لادەست بکەوێت ئەوکاتــە هەڵبــژاردنی بابەتەکــە لەلایــەن مامۆستای سەرپەرشتیارەوە سەرکەوتوو دەبێت و توێــژەر دەتوانێــت لەگــەڵ مامۆستاکەیدا سەبارەت بە بابەتەکە بدوێت و رابگۆرێتەوەو چەند وەلامێکــی دیاریکراوو سودبەخش و پەیوەندیدار بەبابەتەکەیەوە دەست بکەوێت.

### مەرجەکانی هەڵبژاردنی بابەتی توێژینەوە:

#### ١ - نوێکاری و داهێنانکاری:

واتە بابەتەکە نوێ بێت وپێشتر تێیدا نەنوسرابێت یان تۆمار نــەکرابێت و پێشکەش نەکرابێت بۆ بەدەست هێنانی پلەی ماستەرو دکتۆرا.

بۆ ئەم مەبەستەش دامەزراوەکان جەخت دەکەنەوە لەسەر بوونی تۆمارێکی تایبەت بەهەر کۆلێژێك لەهەر زانکۆیەکدا کە بابەتەکانی ماستەرو دکتــۆرای تێدا کۆنووس کرابێت . لەوانە پەسەندنەکردنی بابــەتی دووبــارە بەمەبەســتی نەهێشتنی دیاردەی پشت پێبەستن و دزینــی ئــەدەبی و زانســتی. بۆیــە رێگــە نادرێت کە یەك بابەت بکرێتە توێژینەوە بۆ زیاتر لە نامەیــەك یــان زیــاتر لــە

توێژەرێك لەیەك بابەتدا بنوسێت ، تەنها لەیەك حاڵەتدا نەبێت كە ئەویش تێپەڕبوونی ١٠ساڵە بەسەر هەڵسەنگاندنی بابەتەكەدا .

ئەم قەدەغەكردنەش تەنها لەناو یەك زانكۆدا پەیڕەو دەكرێت . واتە ئەگەر توێژینەوەیەك لە زانكۆیەكی دی پێشكەش كرابێت ئەوا توێژەر دەتوانێت بە هەمان ناونیشان لە زانكۆكەی خۆیدا ئەنجامی بدات.

سەبارەت بەو ماوەیەش كە دەبێت تێیدا توێژینەوەی تۆماركراو ( ماستەر یان دكتۆرا ) هەڵبسەنگێرێت ، ئەوا كەمترین ماوە ٢ساڵە و زۆرترین ماوەشی ٤ ساڵە . وەدەكرێت ئەم ماوەیە درێژبكرێتەوە بە بوونی داوایەك كەلەلایەن كۆلێژ یان زانكۆوە پەسەندكرابێت .

٢ - **ئارەزوومەندی:** مەرجێكی پێویستەو سەركەوتنی توێژینەوەكەی لەسەر بەندە . توێژەر خاوەنی توێژینەوەكەیەتی و لەو ڕوانگەیەوە كەسێتی زانستی خۆی دەچەسپێنێت ، بۆیە پێویستە داهێنانی تێدا بكات . وەچەند پرسیارێك ئاڕاستەی خۆی بكات لەوانەش :

١ - ئایا حەزم لەم بابەتەیەو خوازراوە لام ؟

٢ - ئایا دەتوانم ئەم توێژینەوەیە ئەنجام بدەم ؟

٣ - ئایا دەكرێت نامەیەك لەبارەی ئەم بابەتەوەئامادەبكرێت ؟

٤ - ئایا شایەنی ئەو هەوڵدان و كۆششكردنەیە؟

٥ - ئایا دەكرێت ئەم توێژینەوەیە لەكاتی دیاریكراوی خۆیدا ئامادەبكرێت ؟

٦ - ئایا دەتوانم بەسەر هەموو لایەنەكانی ئەم توێژینەوەیەدا زاڵ ببم ؟ و ئایا دەتوانم مادەی تەواوی بۆ بدۆزمەوە؟

وەهەر پرسیارێکی دی کەوەڵامەکەی توانای ڕاستەقینەی توێژەر و دەستدان و شیاوی توێژینەوەکە بۆ ئامادەکردن دەربخات .

**٣ - ڕوونی و وردەکاری:**

ئەم مەرجە هەردوو ماناو مەبەست دەگرێتەوە . پێویستە بابەتی توێژینەوەکە ڕوون بێت ، ورد بێت لە خستنەڕووی بیرۆکەکانداو گاریگەر بێت لە دارشتن و دەربرینـدا ، بە شێوازێکی شیرین و بەبەکارهێنانی وشەی دیاریکراو . کەواتە ئەرکی توێژەر تەنها هەڵبژاردنی ناونیشان یان بابەت نی‌یە ، بەڵکو وردەکاری هەڵبژاردنە لە ڕووی وتەو دیاریکردنی لە ڕووی مەبەستەوە بەدەربڕینێکی ڕوون و سەرنج ڕاکێش کە هیچ تێکەڵی و ئاڵۆزیەکی تێدا نەبێت .

**٤ - دیاریکردنی وتە (بێژە):**

پێویستە لە بابەتەکەدا ئەو وشانە دیاریکرێن کە مەبەست ڕوون دەکەنەوە، سەرەڕای دوورکەوتنەوە لە درێژبڕی‌یەك کەمەبەست نادات بەدەستەوەو دەبێتەهۆی ئەوەی بابەتەکە ڕەونەقی خۆی لەدەست بدات .هەروەك لەلایەکی ترەوە نابێت بابەتەکە ئەوەندە کورت بێت کە مانای خۆی لەدەست بدات .

**٥ - سەرچاوە:**

**دابین بوونی سەرچاوە مەرجێکی پێویستە بۆ هەڵبژاردنی بابەتی توێژینەوە، پێویستە توێژەر لەو بابەتانە دوربکەوێتەوە کە سەرچاوەیان دەگمەنە بۆ ئەوەی کات و توانای بەفیرۆ نەدات. هەربۆیە پێویست ناکات پەلە بکرێت لە هەڵبژاردنی بابەتی بریقەداردا. لەکاتێکدا هەندێك لە زانایان نرخی زانستی**

نامەكە لەفرە سەرچاوەیی و زۆر خوێندنـەوەی ئـەو سەرچـاوانەدا دەبیـنن ، بەتایبەتی سـەرچاوە تایبەت و بنچینەیی‌یەكان .

دەبێت ئەوەشمان لەیاد نەچێت كە هەڵبژاردنی دروست و تەواوی بابەتەكە چ لـە ڕووی باسكردن یان لـە ڕووی مەرجەكانی هەڵبژاردنەوە بێـت خـۆی لـە خوێندنەوەی فراوانی توێژەردا دەبینێتەوە لـە كتێب وسەرچاوەی بنچینەیی و لاوەكی و كۆن و نوێدا .

## هەنگاوی دووەم- ئامادەكردنی پلانی توێژینەوەكە:

ئەمــەش هــەنگاوی دوای هەڵبــژاردنی بابەتەكەیــە ، پــێش هــەنگاوی كۆكردنــەوەی مانــا زانســتی‌یەكان ، بــەڵام هاوكاتــە لەگــەڵ هــەنگاوی كۆكردنەوەی سەرچاوە زانستی‌یەكاندا .

پلانی توێژینــەوە هــەنگاوی بنچـینەیی و بونیـادی پەیكـەری ڕێكخـراوی توێژینەوەكەیـە . پـلان پـرۆژەی ئەنـدازەیی بـەش و پێكهاتـە واتایی‌یـەكانی توێژینەوەیە. بۆیە پێویستە بە تۆكمەیی دابنرێت و بەوردی وێنەی بكێشرێت.

دیارە نەخشەی توێژینەوەش جیاواز دەبێـت ، بـەپێی هەمـەجۆری خـودی توێژینەوەكان . جا لـەڕووی ئەو ژینگەیەوە بێت كە تێیدا ئامادە دەكرێت یان ئەو زانكۆیەی كە قوتابی پەیڕەوی مەرجەكانی دەكات ...تاد .

هەروەها پێویستە توێژەر لـە پلان داناندا سود لــە پلانــی توێژینــەوەی دی وەربگرێــت نــەك پــەیڕەوی ڕێبازەكــەی بكــات ، بۆئــەوەی پلانەكــە لــە بۆشاییی‌یەكی فكری یان زانستی‌یەوە سەرچاوە نەگرێت.

**هێڵە سەرەکیەکانی پلانی توێژینەوە ئەمانە دەگرێتەوە :**

١ - ناونیشانی توێژینەوە.

٢ - پێشەکی.

٣ - بەش وباس و ناونیشانەکانیان.

٤ - کۆتایی.

**١ - ناونیشانی توێژینەوەکە:** ناونیشان زۆر سنوردارترە لە بابەتەکەو لەهەمان کاتدا مانای بابەتەکە دەخاتەڕوو، هەندێك جاریش ناونیشان خودی بابەتەکەیە . بۆیە باشتر وایە ناونیشانێکی گونجاو هەڵبژێردرێت ، کە بەڵگە بێت لەسەر بابەتێکی زۆر دیاریکراو چونکە بابەتی گشتگیر ڕەنگە زیاتر لە ناونیشانێك هەڵبگرێت.

**ئەو مەرجانەی کە پێویستە لەناونیشانی توێژینەوەدا هەبن:**

(ا) - نوێکاری و داهێنانکاری .

(ب) - وردەکاری و ڕوونی .

(ج) - دیاریکردن "دەست نیشانکردن ".

پێویستە ناونیشان زۆر پەیوەست بێت بەبابەتەکەوە لە ڕووی ماناوەو هەموو پێکهاتە دیاریکراوو خوازراوەکانی توێژینەوەکە لەخۆبگرێت .

وە ناونیشان لەگەڵ پلانی توێژینەوەکە پێشکەش بە ئەنجومەنی کۆلیژ دەکرێت بۆ تۆمارکردنی . لەهەمان کاتدا ناونیشان لەتەك زانیاریەکانی تردا لەسەر بەرگی توێژینەوە یان نامەکە دەنوسرێت .

### ٢- پێشەکی:

ئەمــەش بەشــی دووەمــی پلانــی توێژینەوەکەیــەو شــوێنی لەســەرەتای توێژینەوەکەداو ڕاستەوخۆ لەدوای بەرگەو چــەند بنــەڕەتێك دەگرێتــەوە لــە گرنگترینیان :

#### أ- پێناسەی توێژینەوەکە:

توێژەر لـە پێشـەکیدا پێناسەی توێژینەوەکە دەخاتـەڕوو ، بـۆ ئاشـناکردنی خوێنەران بە بابەتی توێژینەوەکە . تیایدا باسی ئەو ڕەگەزو بیرۆکانـە دەکـات کــە نــاوەڕۆکی بابەتەکــەیان پێکهێنــاوە بــەڵام بــەکورتی. واتــە پێشــەکی بەپێناســەیەکی کــورت و پــوختی بابــەتی توێژینەوەکــەو ئــەو کێشــانەی کــە دەیوروژێنێت دەست پێدەکات .

**ب- مەبەســتی توێژینەوەکــە:** واتــە ئامــانجی ســەرەکیو ئــەو پاڵنەرانــەی کەلەپشت ئامادەکردنەوە خۆیان حەشارداوە ، هەر توێژینەوەیــەك ئامــانج و پاڵنەرو مەبەستی خۆی هەیە کەلەپێناوی بەدیهێنانیدا ئامادەکراوە ، سەرەڕای ئامانجی گشتی هەر توێژینەوەیەك کە ئەویش ئامانجی زانستییە .

واتە توێژەر ئەوە ڕوون دەکاتەوە کــە بــۆ نمونــە مەبەســتی لــە ئەنجامــدانی توێژینەوەکەی، ڕونکردنەوەی پێشکەوتنێك یان ڕاڤەکردنی ڕووداوێکە یان دەربارەی کەسایەتیەك یان ئامانجی دارشتنەوەی کۆمەڵە بڕیارو ڕێککەوتن و ئامۆژگارییەکە ........تاد .

#### ج- توێژینەوەکانی پێشوو :

توێژەر بە کورتی ڕوونی دەکاتەوەو باسی پەیوەندی پتــەویو ئــەو ســودە دەکات کە دەیگەیەنێت بە توێژینەوەکەی.

**د- ڕێبازی توێژینەوەکە :**

بریتی‌یە لە هەنگاوە بنچینەییەکانی توێژینەوەکە ، وێڕای ئەو شێوازو ڕێگایانەی کە بەکاریهێناوە لە ئامادەکردنی توێژینەوەکەیدا ، جا ئەو شێوازانە واتایی بن وەك پەیڕەوو شێوازی پەروەردەیی و شێوازی دەربڕین و .....تاد . یان ماددی بن وەك ئامێرو هۆکارەکانی ڕونکردنەوە ، کە ئەمەش زیاتر پەیوەستە بە توێژینەوەی زانستی کرداریەوە.

**ه- گرنگی توێژینەوەکە :**

توێژەر ئەو لایەنە شاراوەو شێوازو بەڵگانە ڕوون دەکاتەوە کەجێگەی بایەخن بۆ توێژینەوەکەو وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە دەداتەوە کە دەربارەی گرنگی توێژینەوەکەن لەوانەش هۆکارەکانی ئامادەکردنی توێژینەوەکەو بابەت و پاڵنەرەکانی .

**و- ناونیشانە سەرەکیەکانی توێژینەوەکە :**

واتە هەوڵ و کۆششی فکری‌و جەستەیی‌و ماددی . توێژەر ڕادەی پێویست بوونی توێژینەوەکە بەو هەوڵەی کە تیایدا دراوە ڕوون دەکاتەوە بە هۆی ئەو بایەخەی کە هەیەتی .

**ع- سوپاس و پێزانین :**

ئەمەش بۆ هەموو ئەو لایەن وکەسە ماددی و مەعنەوی‌یانەی کەبەشداربوون لە ئامادەکردنی توێژینەوەکەدا ، وەك سەرپەرشتیارو مامۆستاو پسپۆڕان بە بابەتی توێژینەوەکەو ئەمینداری کتێبخانەو بەڕێوەبەری زانکۆو فەرمانبەران لە کتێبخانە و فەرمانگە حکومیەکانداو وەهەر کەسێك کە بەشداربووە لە ئامادەکردندا .

هەندێك پێیان باشەكە لاپەڕەیەكی سەربەخۆ تایبەت بكرێت بـە سـوپاس و پێزانین، كەزۆرجار لـە پێش پێشەكی‌دا دادەنرێت.

**٣ - بەش و باس و ناونیشانەكانیان:**

بەپێی شێوازی نویٚ توێژینەوە دابەش دەكرێت بۆ بەش پاشان بۆ بـاس بـە پێناسـەوە . واتـە ناكرێـت بەشـێك بنوسـرێت بـەبیٚ ناونیشـان. وە توێـژەر دەتوانێت توێژینەوەكە دابەش بكات بۆ بەش بەتـەنها . هـەروەك ژمارەیـەكی دیاریكراو نیـیـە بـۆ بـەش وباسـەكان و توێـژەر بـە پێـی بابەتەكـەی خـۆی دیاری‌دەكات .هەروەها دەبێت ڕەچاوی ئەوە بكرێت كە پەیوەستی و گونجان لـــەنێوان ناونیشـــانی بـــەش و باســـەكانداو نێـــوان ناونیشـــانی ســـەرەكی توێژینەوەكەدا هەبێت . وەبەهەمان شێوە لـەنێوان ناونیشانی بەشـێك و نێـوان ناونیشانی باسەكانیدا .

بەشێوەیەكی گشتی لقە بنچینەیی‌یەكانی بابەتەكانی توێژینەوە بـەم شـێوەیە ڕیزدەكرێت : بەش- باس-بابەت-لق-بەند یان برِگە(باب-مبحث-مطلب-فرع-بند).

**٤ - كۆتایی:**

لـەم كۆتـا بەشـەی پلانـی توێژینـەوەدا ، توێـژەر پوختەیـەكی خێـرا لـە توێژینەوەكە باس دەكات و تیایدا ئاماژە دەكات بۆ ئەو تێروانین و دەرەنجام و بیرۆكـــە ســـەرەكی و پوختەكراوانـــەی كـــە لەتوێژینەوەكەیـــدا پێـــی گەیشتووە .هەروەها ئاماژە دەكات بە نـویٚو داهێنـراو لـە توێژینەوەكـەدا، وێـڕای خسـتنەڕووی كورتـەی ڕاوبۆچـوونی خـۆی دەربـارەی نـاوەڕۆكی توێژینەوەكە ،بەرەزامەندی نواندن بێت یـان تێڕوانینـی پێچـەوانەو جیـاوازی هەبێت .

دەبێت ئەوەشمان لەیاد نەچێت كە ئامادەكردنی پلانی توێژینـەوە بەبـەش و ناونیشانەكانیەوە پێویستە لەتەك بابەتی توێژینەوەكەدا بدرێتە ئەنجومەنی كۆلێژ بۆ ڕەزامەندی نواندن لەسەر بابەتی توێژینەوەی ماستەر یان دكتۆرا .

## ڕاستكردنەوەی پلانی توێژینەوە:

ئەمەش كارێكی پێویست و بەڵگە نەویستە ، لەبەر ڕۆشنایی خوێندنـەوەی هێواشی توێژەر لەكاتی ئامادەكردنی توێژینەوەكەدا .هەروەك پلانی یەكـەمی توێژینەوە كەلە كۆلێژ تۆماركراوە پلانێكی بنەڕەتییەو زۆرجار بەشـێوەیەكی سەرپێیی دانراوەو پشت بەكۆمەڵێك چەمكی سەرەتایی دەبەستێت كە توێژەر بە خوێندنەوەیەكی خێرا پوختەی كردووە ، واتە تەنها پلانێكـی خەملاندنـە . زۆرجار توێژەر ئەوە دەبینێتـەوە كـە پێچـەوانەی پلانەكەیـەتی یـان لەگـەڵ پێكهاتەو بیرۆكەكانیدا ناسازێت و دژ دەوەسـتێتەوە . بۆیـە لـە زانكۆكانـدا ڕێگە دەدرێت بەئەنجامـدانی ڕاسـتكردنەوەو گۆڕانكـاری ، بەمـەرجێك كـە جەوهەری نەبێت و لەسـەر هەنـدێك لەناونیشـانی بـەش وباسـەكان بێـت ، لەگەڵ ناوەڕۆكی بابەتەكەدا لێك نەدات ، ئەگەرنا هەر ڕاستكردنەوەیەك لـە پێكهاتەی پلانەكەدا دەبێتە هۆی گۆڕان لە نـاوەڕۆكی بابەتەكـەداو دواجـار دەبێتەهۆی هەڵوەشاندنەوەی نەخشەی بابەتەكە بەتەواوی .وەلـەم حاڵەتـەدا پێویستە توێژەر بابەتێكی نـوێی دی لەتـەك پلانێكـی نـوێدا پێشـكەش بـە ئەنجومەنی كۆلێژ بكات بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی لەسەری .

## هەنگاوی سێیەم – کۆکردنەوەی سەرچاوە:

ئـــەم هــــەنگاوە هاوکاتـــە لەگـــەڵ هــــەنگاوی ئامــــادەکردنی پلانـــی توێژینەوەکەدا . بـەڵام بەلێکۆڵینـەوەو بەدواداچـوونێکی قـوڵترو ئاگـایی و شارەزایی فـراوانترو گـەڕانێکی زیـاترو کۆکردنـەوەو پەیـداکردنی زیـاتری سـەرچاوەی پەیوەست بە توێژینەوەکەوە .

## ئەم هەنگاوە لەم خاڵانەی خوارەوەدا خۆی دەبینیتەوە :

١-کۆکردنەوەی سەرچـاوەی پەیوەندیـدار بـە توێژینەوەکـە : کـە تیایـدا توێــژەر بابــەت گــەلی زۆرو چــروپڕ دەبینێتــەوە کــە خزمــەت بەبابــەتی توێژینەوەکەی دەکات .

٢ – کۆکردنەوەی سەرچاوەی پەیوەســت بــە دەســتکەوتنی مــاددی یــان کۆنووسکردن ( نوسینەوە ) . ئەویش بە بەدەستهێنانی لە ڕێگەی کـڕین یـان خواستن و پۆلێن کردنیان لە کتێبخانەی ماڵەوەدا ، یان بەنوسینی ناوەکانیان لەکاتێکدا ڕاستەوخۆ دەست نەکەون ئەویش بە نوسینی نـاوی کتێـب یـان سەرچـاوەو نـاوی نوسـەرو سـاڵ و چـاپ و بەشـی پەیوەندیـدار بـە بابـەتی توێژینەوەکە لە پسولەی تایبەتدا .

٣ – کۆکردنەوەی ئەو سەرچاوە کۆنانەی کـە زانیـاری زۆرو بیرۆکـەی ڕۆشن و ئاشکرایان تێدایە .

٤ – پەیداکردن و کۆکردنەوەی سەرچاوەی نوێ ، کـە توێـژەر تێیـدا مەبەستەکەی خۆی دەبینێتەوە لە زانست و بیرۆکەی نوێ و بیردۆزەکان .

٥ – شــارەزابوون لــە دەستنووســەکان – واتــە ئــەو کتێبــە کۆنانــەی کەبەدەست نوسراونەتەوەو سامانێکی زانستی بەرچاوو بنچینەی زانســتەکانی

ئێستان . پێویستە توێژەرتەنها شارەزایی دەربارەی ئەو دەستنوسانە هەبێت کە پەیوەستن بەبابەتی توێژینەوەکەیەوە .

٦ – بەسەرکردنەوەی بلاوکراوە خولیەکان وەك : گۆڤارو رۆژنامەکان کە زۆرجا وتارو توێژینەوەی پەیوەندیدار بەبابەتی توێژینەوەکە بلاودەکرێتەوە تیایاندا .

٧ – بەسەرکردنەوەی بەلگەنامە رەسمیەکان – واتە بلاوکراوەو چاپکراوە حکومیەکان . ئەوانیش لە شێوەی راپۆرت یان سەرژمێری یان توێژینەوەدا بن ، سەرەرای بلاوکراوە ناحکومیەکان .

٨ – بەسەرکردنەوەی دایکی سەرچاوەکان – کەلەلایەن ئینسکلۆپیدیای جیهانیەوە بلاودەکرێنەوە هەرچەندە پەیوەندیشیان بە توێژینەوەکەوە نەبێت ، بەلام بەشداری دەکەن لەدروستکردنی توانستێکی رۆشنبیریدا کە هەموو توێژەرێك پیویستی پیەتی بۆ فراوانکردنی توانا شیکاری و عەقلیەکانی ،لەو کتێبانەش : قورئانی پیرۆزو تفسیرو کتێبی فەرموودەو کتێبەکانی مێژوو زمان،......تاد .

٩ – سەیرکردنی سەرچاوە سەرەتاییە بنچینەییەکان – کە زانیاری و راستی بنچینەییان لەخۆگرتووەو پێشتر راڤە نەکراون لەوانەش :

أ – دەستنوسی بلاونەکراوە .

ب – یاداشتنامەی سەرکردەو زاناو روناکبیران .

ج – وتاری تایبەت .

د – رونکردنەوە.

ه – لێکۆلینەوەکانی شوێنەوارو تابلۆو .....تاد.

و – کتێبی بەلگەی سەرژمێری.

ع – کتێب و سەرچاوەی کۆن و نویێ ڕاڤەنەکراو .

١٠ – سەیرکردنی سەرچاوە دووەمی‌یەکان ، کە ڕاڤەو شیکاری زانیاری سەرچاوە بنچینەییەکانی لەخۆگرتووە . ئەم سەرچاوانە بەشداری دەکەن لە ڕوونکردنەوەی زانیاری‌یە سەرەتایی‌یەکاندا . لەو سەرچاوانەش :

أ – کتێبی کۆن و نویێ گواستراوەو ڕاڤەکراو ، وەك کتێبی وەرگێڕدراوو دەستنوس .

ب – ئینسکلۆپیدیای زانستی.

ج – ڕۆژنامە .

د – ڕاپۆرت.

ه – تێبینی ڕەخنەیی و هەڵسەنگاندنی کتێب و سەرچاوە .

ع – زانیاری وەرگیراو .

**هەنگاوی چوارەم – کۆکردنەوەی ماددەی زانستی:**

لە گرنگترین هەنگاوەکانی ئامادەکردنی توێژینەوەیە ، کە بە(٥) شێوە ئەنجام دەدرێت ئەوانیش :

ا – خوێندنەوە.

ب – هەڵسەنگاندن و تاوتویێ کردن.

ج – کۆنوسکردن – نوسینەوە – .

د – وەرگرتنی زانیاری.

ه – تێبینی و ئەزموون.

## ١ - خوێندنەوە:

خوێندنەوە ڕێبازی لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون دیاری دەکات . سەرەڕای ئەوەی هێنانەدی بەرچاوڕوونی لە بەرامبەر ڕەهەندەکانی بابەتی توێژینەوەکەو دیاریکردنی سنورەکانیو دواتر ڕونکردنەوەی بەش و بیرۆکەکانی و خستنەڕووی تێڕوانینەکانی دروست بن یان هەڵە ، هەمووی بە خوێندنەوە دێتەدی .

هەروەك خوێندنەوەش شێوازو هەنگاوو قۆناغی خۆی هەیەو دەتوانین هەنگاوەکانی خوێندنەوە لە کۆکردنەوەی مادەی زانستیدا بەم شێوەیە کورت بکەینەوە :

١-**خوێندنەوەی خێرای پێرست** : ئەویش بە چاوخشاندنی خێرا بەسەر پێرستی کتێب و سەرچاوە گشتییەکاندا . وە دواتر توێژەر ناوی ئەو کتێبانە تۆمار دەکات کە پەیوەندیان بەباتەکەوە هەیە ، وێڕای نوسینی ناوی سەرچاوەو ناوی نوسەرو بەش و ناونیشان و ژمارەی لاپەڕە .

**٢ - خوێندنەوەی پێرستی سەرچاوەکانی ئینسکلۆپیدیای پسپۆڕی:** بەچاوخشاندنی خێرا بەسەر پێرستی ئەو کتێبانەی زۆر تایبەتن و پەیوەندی توندو تۆڵیان بە توێژینەوەکەوە هەیە.وە ئەم کتێبانە خاڵی دەست پێکردنن بۆ هەر زانیاریەکی نوێ لە سەرچاوە نوێیەکاندا.

٣-**خوێندنەوەی سەرەتایی کتێبە تۆمارکراوەکان** :ئەویش بەخوێندنەوەیەکی سەرەتایی وخێرای ئەو بابەتانەی کە پەیوەندیان بە توێژینەوەکەوە هەیە .

**٤-خوێندنەوەی قووڵ:** ئەمەش بۆ بابەتە پەیوەندیدارەکان لەو پەرتوکانەی کە پێشتر هەڵبژێردراون ،بەوردی و هێواشی و قوڵبوونەوە لە ڕەهەندو بیرۆکەو چەمکەکانیدا .

**٥ - خوێندنەوەی تایبەتمەندیی گشتگیر**:ئەم خوێندنەوەیەش بۆ هەموو ئەو سەرچاوانەی کە پەیوەندیدارو تایبەتن بە بابەتەکانی توێژینەوەکەوە . ئەویش تەنها بە خوێندنەوەی پەرتوکی کۆن و نوێ و بنچینەیی و لاوەکی پەیوەندیدار.

**٦- خوێندنەوەی تایبەتمەندیی یارمەتیدەر:** بۆ ئەو سەرچاوانەی کە پەیوەندی تایبەتمەندی ( پسپۆڕی ) یان بەبابەتی توێژینەوەکەوە هەیە، زانیاریەکان یارمەتیدەرن لە بەهێزکردن و ڕوونکردنەوەو ئاسانکردنی ناوەڕۆکی توێژینەوەکەو بابەتەکانی ، وەك بڵاوکراوەی خولیی و کتێبی بەڵگەیی سەرژمێری و ناساندنی کەسایەتی ڕووداوەکان و کتێبی وەرگێڕدراوو هۆکارەکانی ڕوونکردنەوە، وەك نەخشەو بەڵگە جوگرافیەکان و هی دی .

**٧ - خوێندنەوەی ڕێکخراو:** ئەویش بە ڕێکخستنی کاتەکانی خوێندنەوە ، بەپێی کات و توانای هزری و لاشەیی توێژەر ، پێویستە توێژەر نەخوێنێتەوە لە کاتێکدا کە لە ڕووی فکری و جەستەییەوە ماندووە یان لەو کاتانەی کە تایبەتن بە پشوو کارکردن و پەرستش ......تاد .

**٨ - خوێندنەوە بە پێی شوێن:** دیاریکردنی شوێنی خوێندنەوە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە توێژەرەوە هەیە . وە پەسەندکردن لە نێوان خوێندنەوەی کتێبخانەو ماڵەوە یان لە نێوان کتێبخانەی تایبەت و کتێبخانەی گشتی .

شتێکی ڕێژەیی‌یە لە توێژەرێکەوە بۆ توێژەرێکی دی یان لە کتێبخانەیەکەوە بۆ یەکێکی دی جیاوازە .

**٩ - خوێندنەوەی کتێبخانە:** توێژەر بە پێی پێویستی و بارودۆخی ماددی‌و دەرونی‌و ماڵی خۆی پشتی پێ دەبەستێت .وەهەروەها بەپێی بارودۆخی کتێبخانە لە ڕووی دەوڵەمەندی بەسەرچاوەی پێویست و کاتەکانی خوێندنەوە تیایداو ئەندازەی گونجانی لەگەڵ کاتی توێژەرداو بەپێی یاسای خواستن و خوێندنەوەش تیایدا.

**١٠ - خوێندنەوەی توێژینەوەی نوێ** : سەرەڕای خوێندنەوەی سەرچاوەی هەمەجۆر توێژەر پێویستی بە خوێندنەوەی ئەو توێژینەوە تازانە هەیە کەلە ئینتەرنێت وگۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاودەکرێنەوە . وە زۆرجار ئەم توێژینەوە نوێیانە بنەماو زانیاری سودبەخشیان تێدایە بۆ توێژەر .

### ب - هەڵسەنگاندن و تاوتوێ کردن:

کۆکردنەوەی ماددەی زانستی بەهەمان شێوە لە ڕێگەی گفتوگۆ لەگەڵ کەسانی پسپۆڕو پەیوەندیدار بەبابەتی توێژینەوەکەوە ئەنجام دەدرێت . ئەویش بە گوێگرتنی ڕاستەوخۆ بۆیان و وتووێژکردن لەگەڵیاندا ، کەبەڕونکردنەوەی زارەکی دەبێت یان بەناردنی نوسراو.

**١- ڕوونکردنەوەی زارەکی فێرکردن** : ئەمیش لە ڕێگەی چاوپێکەوتنی مامۆستاو کەسانی پەیوەندیدار بەبابەتی توێژینەوەکەوە دەبێت. وەك: مامۆستای سەرپەرشتیاری نامەکە، بەشێوەیەك کە توێژەر گفتوگۆیان لەگەڵ دەکات و پرسیاریان ئاراستە دەکات و بەزارەکی وەڵامیان لێوەردەگرێت.

**٢- ڕونکردنەوە بە نوسراو ( بەنوسین):** ئەمیش لە ڕێگەی ناردنی نوسراوەوەو بە شێوەیەك کە توێژەر ڕاستەوخۆ بە نوسراوی پرسیارەکانی

دەخاتە بەردەست مامۆستای سەرپەرشتیار یان تایبەتمەند لــە کتێبخانــە یــان بەپۆستدا بۆی دەنێرێت و دواتر توێژەر لەلایەن مامۆسـتاکەیەوە وەلامــەکانی بەدەست دەگاتەوە یان بەهۆی گەشتکردن یان هەر هۆکارێکی دی.

**ج - نوسینەوە:**

توێژەر هەڵدەسێت بە نوسینەوەی پێکهاتەو ڕستەو بابەتەکانی پەیوەست بە توێژینەوەکەیەوە . ئەویش بە نوسینەوەی وەك خۆی یان بــە کورتکردنـەوەو پوختەکردنی .

وە توێژەر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوانەی کە پێشتر کۆی کردونەتـەوەو پەیوەنـدیان بــە توێژینەوەکــەوە هەیــە ،و هەڵدەسـێت بــە خوێندنەوەی بابەتــە دیاریکراوەکــان و پاشــان تۆماریــان دەکــات ،بەنوســین یــان بەوێنــەگرتن . وەتۆمارکردنیش بەنوسین لــە ڕێگــەی نوســینەوەی بابەتەکــە بەتــەواوی وەك خۆی یان گواسـتنەوەی بــە کــورتکراوەیی یــان بــە پوختــەکردنی بیرۆکــەو پێکهاتەکانی بە دارشتن و شێوازی توێژەر .

وەبەشێوەیەکی گشتی زانیاریــەکان لەســەر پســولە یــان لەســەر پــەڕەی ئاسایی ناو دۆسیەی تایبەتدا دەنوسرێنەوە .

**١- نوسینەوە لەسەر پسولە :** پسولە بریتیە لە پارچەیەك کاغــەزی مقــەبا . کەدەشێت هێڵدار بێــت بــە درێــژی ١٠ســم و پــانی ١٤ســم ، وەۆر جــار پسولەکان هەمان قەبارەو ڕەنگیان هەیە یان هەر بەشەو ڕەنگی تایبەتی خۆی هەیــە. پســولەکان بــەپێی ژمــارەی بەشــەکان دابــەش دەکــرێن بەچــەند کۆمەڵەیەکەوە، وە هەر کۆمەڵەیەك زانیاری تایبــەت بەبەشـێکی تێــدا تۆمــار دەکرێت . وەلەیەکێك لەتەنیشتەکانی پسولەکەوە ئەم زانیاریانە دەنوسرێت :

-ناوی نوسەرەکە بەتەواوی .

- ناونیشانی پەرتوكەكە بەتەواوی .
- ناوەندی بلاّوكردنەوە(بلاّوكەرەوە) شوێن و مێژووی بلاّوكردنەوە .
- ڕونكردنەوەی بەش ،و بەرگ ،و لاپەڕەكان .

وە سەبارەت بە گۆڤارەكان ساڵ مانگ، ڕۆژ ،و ژمارەی لاپەڕە دەنوسرێت .

دەربارەی بلاّوكراوەی خولی : ساڵ ،مانگ ،ڕۆژ ، بەرگ ،و ژمارەی ئەو لاپەڕەیەی كە وتارەكەی تێدایە دەنوسرێت .

بەشێوەیەكی گشتی یەك پسولە تایبەت دەكرێت و بابەتەكانی یەك سەرچاوەی تێدا دەنوسرێت . خۆ ئەگەر بابەتەكانی ئەو سەرچاوەیە زۆربوون ئەوا زیاتر لە پسولەیەك بەكاردەهێنرێت .

**٢- نوسینەوە لە دۆسیەدا:** دۆسیە بریتی‌یە لەبەرگێكی مقەبا كە كۆمەڵێك پەڕەی قەبارە ئاسایی جێگیركراوی تێدایە

وەبەشێوەیەكی گشتی یان دۆسیەیەك تایبەت دەكرێت بۆ هەر بەشێك بەباسەكانیەوەو بەڕەنگی جیاواز . وەیان یەك دۆسیە دادەنرێت بۆ هەموو توێژینەوەكە .

توێژەر لە كۆكردنەوەی ماددە زانستی‌یەكەدا هەڵدەسێت بە تۆماركردنی هەر شتێكی پێویست كە لەدوور یان نزیكەوە پەیوەندی بەبابەتی‌توێژینەوەكەوە هەبێت . دواتر جیایان دەكاتەوەو ئەوە هەڵدەبژێرێت كە پەیوەندی توندوتۆڵی بە بابەتی توێژینەوەكەوە هەیە ، دابەشی‌دەكات بەسەر بەش وباسەكاندا هەریەكەو لەژێر ناونیشانی گونجاودا. وە دەبێت ئەوەشمان لەیادنەچێت كەچەمكی كۆكردنەوەی ماددەی زانستی تەنها گواستنەوەی ڕاستەوخۆی بابەتەكە ناگرێتەوە ، بەڵكو هەندێك جار

كورتكراوەوپوختەكراوو تیـرِوانین و بیرۆكـەش دەگرێتـەوە. كـە دارِشـتنی هەریەكەیان بۆ توێژەر بەجێ دەهێلْرێت .

توێژەر هەولْ دەدات پەیوەندی بەردەوامی بەسەرچاوەكانەوە هەبێت ، بـۆ تەواوكردنی دەقی ماددە زانستیەكە ، تـا لـەكۆتاییـدا ماددەیـەكی زانسـتی گەورە كۆدەكاتەوە كە دەبێتە باكگراوندێكی ماددی زانستی كە توێـژەر لـە دارِشتنی توێژینەوەكەدا پشتی پێ دەبەستێت .

## د - زانیاری وەرگرتن:

یەكێكە لە هۆكارەكانی كۆكردنەوەی ماددەی زانسـتی كەلـە هـەنگاوی دارِشتنی توێژینەوەكەدا سـودیان لێوەردەگیرێـت بـەوەی كەئـەم زانیاریـە وەرگیراوانـــە لەلایـــەن توێـــژەرەوە بـــەكاردەهێنرێن لـــەكاتی دارِشـــتنی توێژینەوەكەدا بە شێوازی خۆی . لەگەلْ ئەوەشدا ئەم زانیاریە وەرگیراوانە بە ئاسانی جیادەكرینەوە لە دەربرِین و شێوازی توێژەر . وەهەموو توێـژەرێك پێویستی بە وەرگرتنـی زانیـاری هەیـە تـەنها توێژینـەوەی مەیـدانی نـەبێت ، كەلـەودو پێش لـەبارەیەوە نەنوسراوە .

*** شێوەكانی وەرگرتنی زانیاری :**

١ - **زانیاری وەرگرتن لە كتێب** – لە نوسراوو گۆڤارو بلاوكراوەی خولی كۆن و نوێ .

٢ - **وەرگرتنی زانیاری بیستراو** – لە كۆباس و وتوێژە زانستی‌یەكاندا .

٣ - **لێـوەرگرتنی ڕاسـتەوخۆ** – بـە گواسـتنەوەی ڕاسـتەوخۆی ڕسـتەو دەستەواژە لە نوسراوی كەسانی تر ، بەمەرجێك لەلاپەڕەیەك زیاتر نەبێت .

د/ **وەرگرتنـی زانیـاری پوختـەكراو** – ئـەویش بـە گواسـتنەوەی مانـا لەنوسراوی كەسانی ترەوە بەبێ وەرگرتنی ڕاستەوخۆی وتەو دەسـتەواژەكان و،دارشتنەوەیان بە شێوازی توێژەر خۆی ،ئەوەش لەكاتێكـدا كـە زانیاری‌یـە وەرگیراوەكە لە لاپەڕەیەك زیاتر بێت .

*** مەرج و ڕێساكانی وەرگرتنی زانیاری :**

١ - كورت بێت ، باشتروایە لە لاپەڕەیەك تێپەڕ نەكات.

٢ - تادەتوانرێـت بەشـە وەرگیراوەكـە تێكـەڵ بـە دەقەكـە بكرێـت تـا بەدوایەكدا هاتن و ڕیزبەندی لۆژیكی تێدا بێتەدی .

چـونكە وەرگرتنـی زانیـاری تـەنها كۆكردنـەوەی زنجیرەیـەك لەڕسـتەو دەستەواژەو قسەی خـەڵكی نیـە . وەتوێـژەری بـە توانـا ئـەو كەسـەیە كـە دەتوانێت زانیاری وەرگیراو بەوتـە یـان بـەمانا لـەناو شـێوازەكەی خۆیـداو لەدارشتنەوەی بیرۆكەكانی توێژینەوەكەدا بەكاربهێنێت . تا بتوانێت كەسێتی خۆی لەتوێژینەوەكەدا دەربخات .

٣ - ئاماژەكردن بۆ سەرچاوەی زانیاری‌یە وەرگیراوەكە:

بەتایبەتی لە كارە فكری و هونەریەكاندا وەلەهـەر لێوەرگرتنێكـدا نـاوی نوسـەرەكە بهێنێـت . وە ئامـاژە بەسـەرچـاوەی لێوەرگرتنەكـە بكـات لـە

پەراوێزی خـوارەوەی لاپەڕەكـەدا، ژمـارە یـان هێمایـەكی دیـاریكراوی بـۆ دابنێت . ئەو زانیاریانەی دەربارەی سەرچاوە دەنوسرێت ئەمانەن :

نـاوی نوسـەر، ناونیشـانی كتێـب ، شـوێنی چـاپ ،نـاوی ناوەنـدی بڵاوكردنەوە،ژمارەی چاپ و مێژووەكەی،وبەش و لاپەڕەكەی .بەلاَم ئەوەی پەیوەندی بە بڵاوكراوەی خولییەوە هەیە بریتییە لە : نوسینی ناوی نوسەر ، ناونیشـانیوتار ،نـاوی بڵاوكراوەكـە بـەهێڵ بـەژێرداهێنراویو شوێنیچـاپ لەنێوان دووكەوانەدا ژمارەی دانە یـان بڵاوكـراوەو مێـژووی دەرچـوون و ژمـارەی دوو لاپـەڕەی یەكـەم و كۆتـایی ئـەو وتـارەی زانیاریەكـەی لێ وەرگیراوە .

٤- دانانی نیشانەی زانیـاری وەرگـرتن وەك دووكەوانـە (( )) كـەپێش زانیارییــە وەرگیراوەكــەو لــە كۆتاییەكەیـدا دادەنرێــت . وە لــەكاتی باسكردنی زانیاری وەرگیراودا پێویستە زانیاری وەرگیراوی دووەم نیشـانەی جیاكراوەی هەبێت لە وەرگیراوی یەكەم ،ئەگەر زانیاری وەرگیراو لە ٦ دێڕ تێپەڕی نەكرد ئەوا لە نێوان كەوانەدا دەنوسرێت .

بەلاَم ئەگـەر لـە ٦ دێـڕ تێپـەڕی كـرد بـۆ لاپەڕەیـەك ، ئـەوا بەكەوانـە جیاناكرێتەوە ، بەڵكو بە جیاكراوەیی دادەنرێت ئـەویش بـەوەی بۆشـاییەك بەجێ دەهێڵدرێت لە نێوان بەشی یەكەمی زانیارییە وەرگیراوەكە فراوانتر لە پەراوێزی ئەو دێڕانەی كەوەرنەگیراون ، وە بۆشـایی لـە نێـوان دێڕەكانیـدا كەمتر بێت لە بۆشایی نێوان دێڕە ئاسـاییەكان . وەلـەكاتی چـاپ كردنـدا پیتەكانی زانیارییە وەرگیراوەكە لە پیتەكانی تری نوسینەكە بچوكتر دەبن.

بەلاَم ئەگـەر زانیـاری وەرگـیراو لەیـەك لاپـەڕە تێپـەڕی كـرد ئـەوا نابێـت ڕاستەوخۆ وەك خۆی بنوسـرێتەوە ، بـەڵكو ماناكـەی وەردەگیرێـت . واتـە

دارشـــتنەوەی بـــە شـێوازی توێـــژەرو كورتكردنـــەوەی نـاوەڕۆكی زانیـــاری وەرگیراو وێڕای ئاماژەكردن بەو سەرچاوەیەی كەلیوەی وەرگیراوە .

٥- بنچـینەیی سەرچـاوەكان : واتـە ئـەو سەرچـاوانەی كـە زانیاریـان لێوەردەگیرێت بنچینەیی یان سەرەتایی بن و دانەرەكەیان شارەزایی هونـەری و زانسـتی گـەورەی هـەبێت لــە نوسـینی كتێـب یــان بلاوكردنــەوەی توێژینەوەدا ....تاد .

٦- لەكاتی زیادە خستنەسەر زانیاریەە وەرگیراوەكە پێویستە ئاماژە بـەو بەشە یان ڕستەی زیادكراوبكرێت ئەویش بە دانانی لە نێوان دووكەوانەدا بۆ جیاكردنەوەی لە زانیاریەە وەرگیراوەكە .

٧- لەكاتی لابردنی بەشێك لە زانیاریەە وەرگیراوەكە پێویستە ئامـاژەی پێ بكرێت ئەویش بە دانانی سێ خالّی ئاسۆیی یەك لـەدوای یـەك لەشـوێنی لابراوەكەدا بەم شێوەیە (...).

٨- ڕاستگۆییو وردەكاری لەگواستنەوەیزانیاری وەرگیراودا .

٩- پابەندبوون بە بنەماكانی مۆڵەت دان بـە بـڕی زانیـاری وەرگـیراو . جائەگەر لێوەرگرتنەكە لە سنوری ٣٠٠ وشەدا بوو ئەوا پێویستی بە مۆڵەتی خاوەنەكەی نی‌یە ، بەلام ئەگـەر لـەوە زیـاتر بـوو ئـەوا مۆڵـەت وەرگـرتن پێویستە .

**ه - تێبینی و ئەزموون:**

**تێبینی:** واتە ڕۆچوون لە دیاردەیەك یان بیرۆکەیەکدا یان پەیبردن بە شتێك یان دیاردەیەك لە ڕێگەی وەسف کردنیەوە .بەدەبرینێکی دی واتە بەکارهێنانی هەست و بینایی لە دەرککردنی ڕاستیەك یان باسکردنیدا .

تێبینی واتە ڕازی نەبوون بە ڕاستیو دیاردەی دیارو ڕوکەش و مانای سەرەتایی لە کۆکردنەوەی ماددەی زانستیدا،بۆ گەیشتن بەمانای دووری بیرۆکەو ڕاستییە زانستییەکان کە یارمەتی توێژەر دەدات لەگەشەپێدانی توانا فکریو لێهاتوویە عەقڵییە ناوازەکانیدا ، کە دەتوانێت لە دۆزینەوەی ڕاستی نوێدا بەکاربهێنرێت و سودمەند بێت لە توێژینەوەکەدا .

پێویستە ئەوەشمان لەیادنەچێت کە توانایی تێبینی کردن ڕێژەیییەو جیاوازە بە جیاوازی ئاستەکانی زیرەکی لای تاکەکان . بەلآم

**ئەزموون :** واتە ئەو شارەزاییانەی کە ڕوناکبیر یان توێژەر بە تێبینی و هۆشیاری بەدەستی دەهێنێت ، وێڕای ئەو شارەزاییانەی کە توێژەر پشتیان پێ دەبەستێت لە نزیکبوونەوەی ڕاستییە زانستییە نوێیەکاندا .

شێوازی تێبینی و ئەزموون جێبەجێکردن و شوێنکاری خۆی هەیە لە زۆربەی زانستەکاندا .ڕەنگە زانستە کردارییەکان زیاتر مەیدانی تێبینی و ئەزموون بێت : وەك گەردووناسی ، کیمیا ، پزیشکی ، فیزیا ...تاد .

کەواتە شێوازی تێبینی و ئەزموون دەبێتە باکگراوندو بنەمای داهێنانکاری لای توێژەر. ئەو تێبینی و ئەزموونەکانی دەتوانێت بیرۆکە یان چەمك یان مانایەك دابهێنێت .

## هەنگاوی پێنجەم – دارشتنی توێژینەوەکە:

ئەمەش لە گرنگترین و کۆتا هەنگاوی ئامادەکردنی توێژینەوەیە دوای هەنگاوی کۆکردنەوەی مادە زانستیەکە . بەم هەنگاوە توێژەر توێژینەوەکەی دادەڕێژێت ، لە شێوەی کۆتاییدا دەینوسێت کە ڕاوبۆچوونە نوێیەکانی و شیکارە قوڵەکانی تێدا رەنگ دەداتەوە ، وە لەمیانەی خستنەڕووی توانایی‌یەکانی لە دەربڕین و شێوازدا کەسێتی زانستی خۆی دەسەلمێنێت لە سەربەخۆیی بوونی لە توێژینەوەکەیدا ، هەنگاوەکانی دارشتنی توێژینەوە لە پەیڕەوکردنی چەند بنەمایەکی گشتی‌دا دێتەدی لەوانەش :

١-توێژەر ئەو مادە زانستی‌یەی کە کۆی کردوەتەوە لە پسولە یان لە دۆسیەدا لەبەردەم خۆیدا دابنێت .

٢-توێژەر بابەت بەبابەت یان بڕگە بە بڕگە ئەو مادەیە بەئاگاهی و لەسەرخۆیی بخوێنێتەوە ، وە بەباشی لە بابەتەکە تێبگات و ئاگای لە بیرۆکە سەرەکیەکانی بێت.

٣ – توێژەر بە شێوازو دەربڕین و ڕستەو وشەی خۆی ئەوەی کە خوێندویەتیەوەو ئەوەش لە مێشکیدا گەڵاڵە بووە لە بیرۆکە دەربڕێت.

٤– پێویستە توێژەر رەچاوی جوانی شێوازو شیرینی دەربڕین و ئاسانیەکەی بکات . واتە ڕوون و وردەکار بێت لە دەربڕیندا ، وشەی گونجاو لە شوێنی خۆیدا دابنێت تا بەڵگە بێت لەسەر ماناکانی.

٥ – پێویستی بەکارهێنانی زمانێکی پاراو ، واتە زمانێکی هاوچەرخ ونزیك لە بیروهۆش و ئاسان بۆ تێگەیشتن وێڕای بەکارنەهێنانی وشەو دەستەواژەی بیانی مەگەر لەکاتی پێویستدا نەبێت وەك زاراوەکان و، دورکەوتنەوە لەهەڵەی نوسین و ڕێزمانی .

٦ - وردەکاری لە دەربڕینداو خستنەڕووی ڕاستیەکان بە ڕوونترین و کەمترین وتە دوور لە ئالۆزیو شاراوەیی.

٧ - دورکەوتنەوە لەدووبارەکردنەوەی دەستەواژەو وتەو مانا. ئەمەش بۆ یەك بیرۆکە یان یەك کارو لەزیاتر لەشوێنێکدا.

٨ - کەمکردنەوەی زانیاری وەرگیراوی دیارو بەناوبانگ لە نمونەو شیعرو وتەی بەنرخ.

٩ - دورکەوتنەوە لە زیادەڕەوی و توندی لە ڕەخنەی ڕوخێنەر دژی کەسانی تر یان زیادەڕەوی لە پیاهەڵدانی خودو خراپ باسکردنی کەسانی تر . ئەمەش پێویستی بەدوورکەوتنەوەیە لەبەکارهێنانی وشەو ڕاناوی پیاهەڵدان . وەك بەبۆچوونی من ، ئێمە .......تاد.

١٠ - بابەتی بوون لە نووسینداو بەشێوازی بابەتی بۆ خودی توێژەرو کەسانی تر . ئەویش بەدورکەوتنەوە لەبەکارهێنانی بێژەی سوکایەتی پێکردن و گاڵتەجاڕی و گاڵتەکردن بە زانست و شێوازی کەسانی تر.

١١ - دەرخستنی کەسیتی توێژەر لە توێژینەوەکەدا کارێکی پێویستە ،بۆ پاڵپشتی سەربەخۆیی توێژەر لە داڕشتن و تواناى لەسەر نوسین و زاڵبوونی بەسەر پێکهاتەکانی بابەتەکەیدا . هەموو ئەمانەش خۆی لە ڕاوبۆچوون و تێبینی و ڕەخنەو گێڕانەوەو دروستکردنی هەڵوێست و بیرۆکەی زانستی کۆن و نوێی توێژەردا خۆی دەبینێتەوە .

١٢ - پێویستە زیادەڕەوی نەکرێت لە گواستنەوەو وەرگرتنی زانیاریدا تا توێژینەوەکە نرخی زانستی خۆی لەدەست نەدات

١٣ - پێویستە هەر بەشێك بە پێشەکی دەست پێبکات . پێش چوونەناو ناوەڕۆکی داڕشتنەکە .وەبە کۆتاییەکی کورتیش بەپایان بگەیەنرێت کە

تێیدا توێژەر پوختەی بەشەكەو ڕاوبۆچوونەكانی دەربارەی بیرۆكەی بەشـەكە دەخاتەڕوو.

١٤ – دەتوانرێـت گۆڕانكـاری لــە بابــەتی گواســتراوەو وەرگــیراودا بكرێت . بە زیادكردنی تازە لەناویداو لەنێوان دوو كەوانەدا .یان بەلابردنی كۆن و دانانی سێ خاڵی ئاسۆیی لە شوێنی بڕگە یان ڕستەی لابراودا .

١٥ – دوركەوتنەوە لە شتی بێ سـود لەدارِشـتندا وەك درێـژبڕی بـێ ئاكام .

## هەنگاوی شەشەم – پێڕستكردنی سەرچاوەكان:

واتە تۆمـاركردنی ئـەو سەرچـاوانەی كـە توێـژەر پشـتی پـێ بەسـتووە ، لەئامادەكردنی توێژینەوەكەدا ، جا سودی لێ وەرگیرا بێت یان نە ، ڕووبەری سود لێوەرگرتن تیایدا زۆربێت یان كەم .

### *ڕێگەی ڕێكخستنی سەرچاوەكان:

**ڕێگەی یەكەم** نوسینی سەرچاوەكان لە كۆتایی هەر بەشێكدا .

**ڕێگەی دووەم**- نوسینی هەموو سەرچاوەكان لە كۆتایی توێژینەوەكەدا .

١– نوسینی سەرچاوەكان لە كۆتایی هەربەشێكدا :

واتە كۆنوسكردنی سەرچاوەكانی بەشێك لە كۆتاییەكەیدا . بەشـێوەیەك كە هەر بەشێك بە باسەكانییەوە سەربەخۆ دەبێت . لە خراپـی ئـەم ڕێگەیـە پارچـەبوونی سەرچـاوەی پەرتوكەكەیـە لــە نێـوان بەشـەكانیدا . كەئەمـەش قورسـاییەك دروسـت دەكـات لەسـەر توێـژەر یـان خوێنـەر لــەكاتی گەڕانەوەی بۆ ئەم سەرچاوانە .

٢–نوسینی هەموو سەرچاوەكان لە كۆتایی توێژینەوەكەدا :

لەم ڕێگەیەدا توێژەر یان خوێنەر بەئاسانی دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەكان .

**بنەماكانی ڕێكخستنی سەرچاوە:**

١ - نوسینی سەرچاوەكان بە ڕێكوپێكیو دەست پێكردن بە ناوی نوسەر یان ناونیشانی پەرتوك . وە باشتر وایە بەناوی نوسەر دەست پێ بكرێت .

٢- نوسینی ناوی دانەرو لەدوایەوە دوو خاڵ ( : ) .

٣- نوسینی ناونیشانی پەرتوكەكەو لە دوایەوە ئەم نیشانەیە (-) .

٤- ژمارەی چاپ و لەدوایەوە (-) .

٥- ناوەندی بڵاوكردنەوەو لەدوایەوە (-) .

٦- ساڵی بڵاوكردنەوەو لەدوایەوە فاریزە ( ، ) .

٧- ئەگەر پەرتوكەكە بەبێ ژمارەی چاپ بڵاوكرابویەوە ئەوا ژمارەی چاپ و بەرگ نانوسرێت .

٨-ئەگەر كتێبەكەبەبێ ناوی بڵاوكەرەوە دەرچووبوو ئەوا لە نێوان دووكەوانەدا دەنوسرێت ( بەبێ بڵاوكەرەوە ) .

٩- ئەگەر كتێبەكە بەبێ بەروار دەرچووبوو ئەوا لە نێوان دووكەوانەدا دەنوسرێت ( بەبێ بەروار ) .

١٠- ئەگەر كتێبەكە لە میانەی زنجیرەیەكدا دەرچووبوو ، ئەوا ناوی دانەر پاشان ناونیشانی كتێبەكە پاشان ژمارەی كتێبەكەو ناوی زنجیرەكە دواتر ژمارەی چاپ و لە كۆتاییدا ناوی ناوەندی بڵاوكەرەوەو ساڵی بڵاوكردنەوە دەنوسرێت .

١١- ئەگەر كتێبەكە لەلایەن دەستەیەكەوە دەرچووبوو ئەوا ناونیشانی كتێبەكە پاشان دەستەكەو دواتر زانیاریەكانی تر دەنوسرێت .

١٢– ئەگەر کتێبەکە وەرگێڕاو بوو ، ناوی دانەر پاشان ناونیشانی کتێب ، پاشان ناوی وەرگێڕو دواتر زانیاریەکانی تر دەنوسرێت .

١٣– ئەگەر کتێبەکە دوو دانەری هەبوو ئەوا ناوی هەردوو دانەرەکە دەنوسرێت .

١٤ – پێویستە ناوی نوسەر ( دانەر ) بەو شێوەیە بنوسرێت کەلەسەر کتێبەکە نوسراوە ، وەهەروەها نازناوەکەی وەك : دکتۆر یان مامۆستا یان پرۆفیسۆر ، ...تاد .

١٥– دەتوانرێت بەناوی یەکەمی دانەر یان بەناوی خێزان دەست پێبکرێت و باشتر وایە دەست پێکردن بەناوی یەکەم بێت.

١٦– ئەگەر سەرچاوەکە وتارێك بوو لەیەکێك لە بلاوکراوە خولیەکاندا ئەوا ناوی بلاوکراوەکەو دەرخستنی ئەویش بە دانانی هێڵ لە ژێریدا یان نوسینی بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا . وەناوی وتارەکە لە نێوان دوو کەوانەدا دەنوسرێت و پاشان زانیاریەکانی تری وەك : دانەرو ساڵ و ژمارەی دانەو مێژووی دەرچوون و پاشان ژمارەی لاپەڕە دەنوسرێت .

١٧– ئەگەر نوسەری وتارەکە لەناو بلاوکراوە خولیەکەدا ناوی نەبوو ، ئەوا زانیاریەکانی دی دەنوسرێت .

١٨– ئەگەر کتێبەکە بە زمانی بیانی بوو ، ئەوا زانیاریەکان لەبارەیەوە بە زمانی بیانی دەنوسرێت و لەچەپەوە بۆ ڕاست و ناوی دانەرو ناونیشانی کتێب پاشان زانیاریەکانی دی دەنوسرێت .

١٩– ئەگەر نوسەرێك زیاتر لە کتێبێکی هەبوو ئەوا ناوی هەموو کتێبەکانی ڕاستەوخۆ لە دوای ناوی خۆی دەنوسرێت و هەر کتێبەو ژمارەی تایبەتی خۆی پێ دەدرێت .

لەم ڕێگەیەدا توێژەر یان خوێنەر بەئاسانی دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکان .

**بنەماکانی ڕێکخستنی سەرچاوە:**

١- نوسینی سەرچاوەکان بە ڕێکوپێکیو دەست پێکردن بە ناوی نوسەر یان ناونیشانی پەرتوك . وە باشتر وایە بەناوی نوسەر دەست پیێ بکرێت .

٢- نوسینی ناوی دانەرو لەدوایەوە دوو خاڵ ( : ) .

٣- نوسینی ناونیشانی پەرتوکەکەو لە دوایەوە ئەم نیشانەیە (–) .

٤- ژمارەی چاپ و لەدوایەوە (–) .

٥- ناوەندی بلاوکردنەوەو لەدوایەوە (–) .

٦- ساڵی بلاوکردنەوەو لەدوایەوە فاریزە ( ، ) .

٧- ئەگەر پەرتوکەکە بەبێ ژمارەی چاپ بلاوکرابویەوە ئەوا ژمارەی چاپ و بەرگ نانوسرێت .

٨-ئەگەر کتێبەکەبەبێ ناوی بلاوکەرەوە دەرچووبوو ئەوا لە نێوان دووکەوانەدا دەنوسرێت ( بەبێ بلاوکەرەوە ) .

٩- ئەگەر کتێبەکە بەبێ بەروار دەرچووبوو ئەوا لە نێوان دووکەوانەدا دەنوسرێت ( بەبێ بەروار ) .

١٠- ئەگەر کتێبەکە لە میانەی زنجیرەیەکدا دەرچووبوو ، ئەوا ناوی دانەر پاشان ناونیشانی کتێبەکە پاشان ژمارەی کتێبەکەو ناوی زنجیرەکە دواتر ژمارەی چاپ و لە کۆتاییدا ناوی ناوەندی بلاوکەرەوەو ساڵی بلاوکردنەوە دەنوسرێت .

١١- ئەگەر کتێبەکە لەلایەن دەستەیەکەوە دەرچووبوو ئەوا ناونیشانی کتێبەکە پاشان دەستەکەو دواتر زانیاریەکانی تر دەنوسرێت .

١٢– ئەگەر كتێبەكە وەرگێڕاو بوو ، ناوی دانەر پاشان ناونیشانی كتێب ، پاشان ناوی وەرگێرو دواتر زانیاریەكانی تر دەنوسرێت .

١٣– ئەگەر كتێبەكە دوو دانەری هەبوو ئەوا ناوی هەردوو دانەرەكە دەنوسرێت .

١٤ – پێویستە ناوی نوسەر ( دانەر ) بەو شێوەیە بنوسرێت كەلەسەر كتێبەكە نوسراوە ، وەهەروەها نازناوەكەی وەك : دكتۆر یان مامۆستا یان پرۆفیسۆر ، ...تاد .

١٥– دەتوانرێت بەناوی یەكەمی دانەر یان بەناوی خێزان دەست پێبكرێت و باشتر وایە دەست پێكردن بەناوی یەكەم بێت.

١٦– ئەگەر سەرچاوەكە وتارێك بوو لەیەكێك لە بلاوكراوە خولیەكاندا ئەوا ناوی بلاوكراوەكەو دەرخستنی ئەویش بە دانانی هێڵ لە ژێریدا یان نوسینی بە شێوەیەكی ڕوون و ئاشكرا . وەناوی وتارەكە لە نێوان دوو كەوانەدا دەنوسرێت و پاشان زانیاریەكانی تری وەك : دانەرو ساڵ و ژمارەی دانەو مێژووی دەرچوون و پاشان ژمارەی لاپەڕە دەنوسرێت .

١٧– ئەگەر نوسەری وتارەكە لەناو بلاوكراوە خولیەكەدا ناوی نەبوو ، ئەوا زانیاریەكانی دی دەنوسرێت .

١٨– ئەگەر كتێبەكە بە زمانی بیانی بوو ، ئەوا زانیاریەكان لەبارەیەوە بە زمانی بیانی دەنوسرێت و لەچەپەوە بۆ ڕاست و ناوی دانەرو ناونیشانی كتێب پاشان زانیاریەكانی دی دەنوسرێت .

١٩– ئەگەر نوسەرێك زیاتر لە كتێبێكی هەبوو ئەوا ناوی هەموو كتێبەكانی ڕاستەوخۆ لە دوای ناوی خۆی دەنوسرێت و هەر كتێبەو ژمارەی تایبەتی خۆی پێ دەدرێت .

## ڕیزکردنی سەرچاوەکان :

١ –ڕێکخستنی سەرچاوەکان بە پیٛی ئەلف بیٛ و دەست پێکردن بەناوی نوسەر یان دانەر .

٢ –یان ڕێکخستنی سەرچاوەکان بە پیٛی ئـەلف بـیٛ و دەسـت پێکـردن بەناوی کتێبەکان.

٣ –ڕێکخستنی سەرچـاوە گشـتی و گرنگـەکان بـە پـیٛی ئـەلف بـیٛ و لەپێشینەیی .

٤ –ڕێکخستنی سەرچاوەکان بە پیٛی ئەلف بیٛ و دەست پێکردن بەناوی کتێبی کۆن پاشان کتێبی نویٛ .

٥ –ڕێکخسـتنی بڵاوکراوەکـان بـە پـیٛی ئـەلف بـیٛ و لـە لاپەڕەیـەکی سەربەخۆداو جیاواز لە کتێبەکان .

٦ –ڕێکخسـتنی کتێبـە بیانی‌یـەکان بـە پێـی ئـەلف بـیٛ و لـە لاپـەڕەی سەربەخۆدا جیا لە کتێبە کوردیەکان.

## نوسین لە پەراوێز (پاشکۆ) دا:

ئەمـەش هـەنگاوێکی گرنگـە بـۆ پتـەوکردنی توێژینەوەکـە ، لـەڕووی دەستەبەری سود یان سپاردەی زانستی‌یەوە .

بەشێوەیەکی گشتی پاشکۆ لە پەراوێزی خوارەوەی لاپەڕەکەدا دەنوسرێت ، بە پێچـەوانەی ئـەو پاشـکۆیەی پێشـوو کەلەسـەر تەنیشـت و لـە نێـوان دێرەکاندا دەنوسرا. وە بنەماکانی پاشکۆ نوسین لـە پـەراوێزدا ئـەم بارانـەی خوارەوە دەگرێتەوە :

١-لـەکاتی بەڵگـە هێنانـەوە بەئایەتـەکانی قورئـان . نـاوی سـورەتەکەو ژمارەی ئەو ئایەتە دەنوسرێت کە بە بەڵگە هێناویەتیەوە .

٢-بەڵگەهێنانەوە بەفەرموودەکانی پێغەمبەر . لێرەوە ئاماژە بەسەرچاوەی فەرمودەکە یان گێرەرەوە یان وشەی

( متفق علیه یان صحیح ) دەکرێت .

٣-ناوبردنی سەرچاوەکە لـە کـاتی گواسـتنەوەی بابەتێکـدا وەك خـۆی بەشێوەیەك کە دێرە گواسـتراوەکان لـە نێـوان دوو کەوانـەدا دەنوسـرێن و لەسەر کۆتا وشە هێمایەك بەژمارە یان بەشێوەیەکی دیاریکراو دەنوسـرێت و هەمان هێما لە پەراوێزدا دوبارە دەکرێتەوە بۆ ئاماژەکردن بەسەرچاوەکە .

وەئەگەر سەرچـاوەکە بـۆ یەکـەم جـارە لـە پـەراوێزدا بنووسـرێت ئـەوا پێویسـتە هەموو زانیاریەکان لەبارەیـەوە بەتـەواوی بنوسـرێتەوە : وەك نـاوی دانەرو ناونیشانی پەرتوك و بەش و ژمـارەی چـاپ و بلاوکردنـەوەو سـاڵ و ولات ولاپەرە، بەلام ئەگەر ناوبردنی سەرچاوەکە دووبارەبوو ئەوا تەنها ناوی دانەرو ناونیشانی پەرتوك و ژمارەی لاپەرە دەنوسرێتەوە .

بەلام ئەگەر دووبارەبوونەوەکە ڕاستەوخۆ دوای ناوبردنی سەرچاوەکە بوو لە برگەی پێشوتردا ئەوا تـەنها دەنوسـرێت : سەرچـاوەی ئامـاژە پێکـراوی پێشوو.

٤ - ناوبردن یان باسکردنی ئەو سەرچاوانەی کە پەیوەندیان بە بیرۆکـە یان بەشێکی هاتوەوە هەیە لە یەکێك لە لاپەرەکانی توێژینەوەکـەدا . توێـژەر بۆ پرسین لەبارەیانەوە ئاماژەی پێ دەکات .

٥ – باسكردنى ڕوونكردنەوەو لێكدانەوەى ئەو بيرۆكە گشتى و ئالۆزانەى كەلە توێژینەوەكەدا هاتوون و زيادكردنى مەرجى پێويست بۆ ڕوونكردنەوەى دەقى نامەكە .

٦ – باسكردنى ئەو توانجانەى كەلەسەر بيرۆكەو چەمك و بيردۆزەكانى ناو توێژینەوەكە هاتوون .

٧ – ڕاڤەى ئەو ناوە زانستى و هونەريانەى كەلە توێژینەوەكەدا هاتوون .

٨ – كورتەى ژيننامەى ئەو ناوە ناسراوو كەسايەتيانەى كەلە توێژینەوەكەدا خراونەتەڕوو .

٩ – هەواڵەكردن بۆلاى ئەو بيرۆكەو بەش و خاڵ و بيردۆزانەى كە پێشتر و لەبەشێكى ترى توێژینەوەكەدا هاتوون لەگەڵ ناوبردنى ژمارەى لاپەڕەكەى .

## كورتكردنەوەكان:

ئەمەش پەيوەستە بەو وتەو وشەو زاراوەو دەربڕينانەى كە دووبارەدەبنەوە لە توێژینەوەكەدا . وە ڕێككەوتن هەيە لەسەر كورتكردنەوەيان و پێدانى هێماى تايبەت بەهەريەكەيان كە پێی دەناسرێتەوە . وە پێويستە توێژەر ئەم كارە ئەنجام نەدات ئەگەر بەكارهێنانى باو نەبێت .

## هێماكانى ڕەنوسكردن:

ئەم هێمايانە يارمەتيدەرن لەسەر تێگەيشتن و زانينى مەبەست لە وتەو ڕستەكان ، بەهۆيانەوە توێژەر ماددە زانستيیەكە دادەڕێژێتەوەو دەتوانين بەم شێوەيەى خوارەوە شوێنى هێماكانى ڕەنوسكردن ڕوون بكەينەوە :

١-خاڵ (٠) لەکۆتایی ڕستەی پڕواتادا ، وە دوای تەواوبوون یان کۆتایی هاتنی قسە دادەنرێت ، وەك : ژیان لە سایەی قورئاندا گەورەترین هەنگاوی سەفەرو جوانترین چرککەکانی تەمەنە .

٢-دوو خاڵی ستونی (:) کەلەم بارانەدا دادەنرێت :

أ- لەنێوان ڕستەی ئاخاوتن و گوتەدا .

ب- لەنێوان بابەتێك و بەشەکانیدا .

وەك : زانکـۆی سـلێمانی پێکهـاتووە لـە : کـارگێڕی و کۆلێـژ و کتێبخانە ...تاد .

ج- لەکاتی نمونە هێنانەوەدا .

وەك : هێماکانی ڕەنوسکردن زۆرن لەوانە ( وەك ) : خـاڵ ، جیاکـەرەوە ( کۆما ) ، کۆماوخاڵ .

٣- جیاکەرەوە ( ، ) کەئەمە شوێنەکانیەتی :

أ- دوای بێـژەی بـانگهێن .وەك: دادپـەروەران ، لـە قسـەکردندا داد بەکاربهێنن .

ب- لەنێوان ئامرازی لێکدەرو لێکدراودا.

نمونە / زۆر کەس هەن ڕۆژی چەند جـار دەموچـاویان دەشـۆن ، کەچـی ساڵی جارێك دڵیان ناشۆن .

ج- لەنێوان ڕستەی مەرج و ڕستەی وەڵامـدا .وەك : ئەگـەر بخوێنیـت ، دەردەچیت .

د- لەنێوان سوێندو وەڵامدا . وەك : سوێند بەخوا ، لێت دەبورم .

٤- جیاکـەرەوەو خـاڵ ( خـاڵ و کۆمـا ) و شـوێنەکەی : لـەنێوان دوو ڕستەدا کە دووەمیان هۆیە بۆیەکەم وەك :

لەبەزەیی خوا بێ ئومێد بوو " لەبەرئەوەی بێ باوەڕە .

٥-نیشانەی پرسیار (؟) و شوێنەكەی كۆتایی ڕستەی پرسیارە .

٦-نیشانەی سەرسوڕمان (!)شوێنی كۆتایی سەرسوڕمان ، یان دڵتەنگی، یان شادی ....

وەك : ئاسمان چەند جوانە !

٧-(-) و شوێنەكەی :

أ- لەبری دووبارەبونەوە بۆ ئەو ناوانەی كە لە گفتۆگۆ یان لە چیرۆك، ...دووبارە دەبنەوە .

وەك : چیا بە دەریای وت : كەی ئامادە بوویت ؟

-دوێنێ .

-چیت لەگەڵ خۆت هێنا .

-هەموو ئەو شتانەی كەداوات لێكردم .

ب- لە نێوان ژمارەو ژمێردراودا ئەگەر لەسەرەتای دێڕدا بوو .

وەك : یەكەم - یان ١-

دووەم - ٢-

٨ - (- -) شوێنیان لە پێش وە دوای ڕستە.

٩ - كەوانە ( ) یان (( )) یان[ ] وە شوێنیان بەم شێوەیە :

ا-(( )) لە نێوانیاندا ئەو ڕستەیە دادەنرێت كەوەك خۆی لە پەرتوكی كەسانی ترەوە وەرگیراوە .

ب-دووكەوانەی بچوك :( ) لە نێوانیاندا دەستەواژەی لێكدانەوەو پاڕانەوەی كورت دادەنرێت .

وەك: ( درودی خوای لێ بێت ) .

ج- دووکەوانەی گەورە:[ ] لەنێوانیاندا هەر زیادە یان خستنەسەرێك دادەنرێت کە توێژەر دەیخاتە ناو دەقێکی گواستراوە یان وەرگێراوەوە.

١٠- نیشانەی لابردن (...)ئەم سێ خاڵە ئاسۆیی یە لە شوێنی لابراوێك لە بەشێکی وەرگێراودا دادەنرێت .

# باسی پێنجەم

## ڕێکخستنی توێژینەوەکە

### ڕێکخستنی توێژینەوەکە :

ڕێکخستنی گشتی توێژینەوەکە بە کارێکی بنچینەیی دادەنرێت و ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە :

١-چاپکردنی توێژینەوەکە.

٢-بەرگ تێگرتنی توێژینەوەکە

٣-ڕێکخستنی توێژینەوەکە

٤-ڕەنوسکردنی توێژینەوەکە

### یەکەم-لەچاپ دانی توێژینەوەکە:

هەندێك جار بە لەبەرگ گرتنـەوەی توێژینـەوە ناودەبرێـت . وە توێـژەر سەربەخۆیە لە هەڵبژاردنی جۆری چاپەمەنیدا : وەك بە ئامێری نوسـین یـان نوفیست یان چاپخانە یان وێنەگرتنی کاردەبێ ....تاد .

وەبەچاوپۆشین لەجۆری چاپەمەنیەکە . پێویسـتە توێـژەر چـاودێری بنـەما گشتییەکانی لەچاپ دان بکـات .وەك: جـۆری قـەبارەو قـەبارەی پیـت و وشەو نوسین و فراوانی پەراوێزو چۆنیەتی ڕەنوسکردن و هێمـاو شـوێنەکانی وەك ئەوەی لەلاپەڕەکانی سەرەتادا ژمارەدانان بە پێتی ئەلف بێ و لاپەڕەکانی تری لە ناوەرۆکدا ژمارەییە . وەهەروەها پێویستە چاودێری قەبارەی نوسین و ماوەی نێوان دێرەکان بکرێت . بەشێوەیەك کە قەبارەکـەی لەلاپەڕەکەکـە گەورەتر بێت و ماوەکان لە دەقدا فراوانتر بێت وەك لـەوەی لـە پـەراوێزدا هەیە.

ژمارەی تیراژی چاپکراو :

بەپێی جیاوازی یاسای زانکوو کولێژەکان جیاوازەو دەگۆڕێت . بەلام بەلایەنی کەمەوە پێویستە ئەندامانی لیژنەی هەلسەنگاندن هەریەکەو تیراژێکیان لابێت . وە توێژەر تیراژێك و یەك تیراژیش بەلایەنی کەمەوە بۆ کتێبخانەی کۆلێژ.

**دووەم-بەرگ تێکرتنی توێژینەوەکە :**

ئەمەش کارێکی پێویستە کە توێژەر پێی هەلدەستێت . پێش سپاردنی توێژینەوەکە بە ئەندامانی لیژنەی هەلسەنگاندن یان زانکۆ یان کتێبخانە .

سێ یەم- ڕێکخستنی توێژینەوەکە :

مەبەستمان لێی بەشە سەرەکیەکانی توێژینەوەکەیە کە ئەمانە دەگرێتەوە :

**ا - لاپەڕەی بەرگی دەرەوە :** لەسەر ئەم لاپەڕەیە ئەمانە دەنوسرێت . ناونیشانی توێژینەوەکە پاشان ناوی ئەو کولێژو زانکۆیەی کە توێژینەوەکەی تیدا پێشکەش کراوەو ناوی مامۆستای سەرپەرشتیاری توێژینەوەکەو ناوی ئەندامانی لیژنەی هەلسەنگاندن و لەبەشی خوارەوەی لاپەڕەکەشدا ئەو ساڵەی کە تێیدا توێژینەوەکە هەلسەنگێنراوە.

**ب- لاپەڕەی بەرگی ناوەوە:**

ئەمەش لاپەڕەی دوای بەرگە ڕاستەوخۆ. هەمان ئەو زانیاریانەی لەسەر دەنوسرێت کە لەسەر لاپەڕەی بەرگی دەرەکیە .

**ج - لاپەڕەی ناوەڕۆك یان بابەتەکانی توێژینەوەکە** :

لەم لاپەڕەیەدا ئەم زانیاریانە تۆمار دەکرێن :

١-ناونیشانی توێژینەوەکە بەبێ ژمارە .

٢-تەنها وتەی پێشەکی . ڕەنوسکراو بە پیتی ئەلف بێ.

٣-وتەى سەرەتا بەتەنها . رەنوسكراو بە پیتى ئەلف بى.

٤- بەش و باس و ناونیشانەكانیان . رەنوسكراو بە ژمارە بەو شێوەیەى كەلە توێژینەوەكەدا هەیە .

٥- وتەى كۆتایى بەتەنها .رەنوسكراو بە ژمارە .

وە لیرەدا پێویستە ئاماژە بە نوسینى لاپەڕەى ناوەڕۆك یان بابەتەكانى توێژینەوەكە بكەین لەسەرەتاى توێژینەوەكەداو راستەوخۆ دواى لاپەرەى بەرگى ناوەوە" بۆ ئەوەى ناوەرۆك لەسەرچاوەكان جیابكەینەوەو سەیركردنى ناوەرۆك و پێكهاتەكانى توێژینەوەكە لاى خوینەر ئاسان بێت .

**د- لاپەڕەى پێشەكى توێژینەوەكە** : كە ئەم بنەمایانەى تیدا باس دەكرێت :

١- پێناسەى بابەتى توێژینەوەكە .

٢-ئاماژەكردن بە گرنگى بابەتەكە .

٣- ئاماژەكردن بۆ ئەو مەسەلە زیندوو نوێیانەى كەتوێژینەوەكە دەیوروژێنیت .

٤- مەبەست لە ئامادەكردنى توێژینەوەكە.

٥- باكگراوندى زانستى و مێژوویى توێژینەوەكە .

٦- هۆكارەكانى هەڵبژاردنى بابەتى توێژینەوەكە .

٧- ناونیشانە سەرەكیەكانى توێژینەوەكە . كە ئەوانیش تەنها ناونیشانى بەشەكانن .

٨- ئەو روونكردنەوانەى كە بەشدارى دەكەن لە تێگەیشتنى بابەتى توێژینەوەكە.

**هـ- لاپەڕەی سەرەتا:**

ڕاستەوخۆ لەدوای پێشەکی دێت و تێیدا باسی هەوڵدانی توێژەر دەکرێت لە ئامادەکردنی توێژینەوەکەدا هەر لــە تۆمارکردنیــەوە تـا کۆتـایی هـاتنی و چاپکردنی .وەهەروەها توێژەر باسی (لایەن و فەرمانگـە ڕەسمـی و حکـومی و نارەسمیـــەکان و سەرپەرشـــتیارو پســـپۆڕان ) ی پەیوەندیـــدار بەبابـــەتی توێژینەوەکەوە دەکات : وەك ئەمینداری کتێبخانە گشتی و تایبەتەکان . وتەی سوپاس ئاراستەی ئەوان و هەموو ئەوانەش دەکات کە بەشـداربیان کـردووە لە ئامادەکردنی توێژینەوەکەو هێنانەبوونیەوە .

**و- لاپەڕەکانی دەقەکە:**

ئەمەش لاپەڕەکانی بەش و باسە ڕاڤەکراوەکانـەو بڕبـڕەی توێژینەوەکەیـە بەبنەڕەت و ڕونکردنەوەو بیرۆکەو بەشە زانستیەکانیەوە سەرەڕای بیروڕای توێژەرو ئەو شێوازەی مادەکەی پێ دارشتووەو هەروەها سەرژمێری وخشتەو وێنەکانی ...تاد.

**ع- لاپەڕەی کۆتایی:**

کۆتـا لاپەڕەیــە لەدارشـــتنەکەداو پوختەیــەك لــە بابــەتی توێژینەوەکــەو هەڵسەنگاندن و دیدوبۆچوونی توێژەر ( واتە بیروڕاکانی بەرەزامەنـدی بێـت یان دژایەتی ) لەخۆدەگرێت .

**ح- لاپەڕەی پێڕستی سەرچاوەکان:**

کۆتا بەشێکە کەلەتوێژینەوەکەدا دەنوسرێتەوەو هەموو سەرچاوە کوردیو بیانیەکان دەگرێتەوە .

## چوارەم – ڕەنوسکردنی توێژینەوەکە:

ڕەنوسکردن ( یان ژمارە دانان ) دابەش دەکرێت بۆ دوو جۆر :

جۆری یەكەم–ڕەنوسكردن بە پیتی ئەلف بێ.

جۆری دووەم–ژمارەدانان بە ڕەنوسی ژمێرەیی .

## جۆری یەكەم- ڕەنوسكردن بە پیتی ئەلف بێ:

تەنها ڕەنوسی لاپەڕەكانی پێشەكی و سەرەتای پێدەكرێت و ئەم ڕەنوسكردنە ڕەنوس و ژمارەی لاپەڕەكانی توێژینەوەكە ناگرێتەوە . ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە لاپەڕەی بەرگی ناوەوەو لاپەڕەی ناوەڕۆكی توێژینەوەكە هەرگیز ژمارەیان بۆ دانانرێت.

**جۆری دووەم- ڕەنوسكردن بەڕەنوسی ژمێرەیی:**

ڕەنوسی هەموو لاپەرەكانی توێژینەوەكەی پێدەكرێت : لە لاپەڕەی بەش و باس و كۆتاییو لاپەڕەی پێرستی سەرچاوەكان .وەڕەنوسی ژمێرەیی دوو ڕێگەی هەیە :

**ڕێگەی یەكەم** :بۆ نوسینی ژمارە زنجیرەییەكان لەبەشی سەرەوەی لاپەڕەكانداو لەسەرو یەكەم دێڕی یەك لاپەڕەدا .

**ڕێگەی دووەم** : ژمارەدانان بۆ لاپەڕەكان بە نوسینی ژمارەكان لەبەشی خوارەوەی لاپەڕەكەدا ، واتە لە ناوەڕاستی بەشی خوارەوەی لاپەڕەكەداو لە ژێر كۆتا دێڕو پەراوێزەكاندا

## سیفەتە گشتی‌یەکانی توێژەر

گەر مەبەست و ئامانجەکانی توێژینەوە لە خوێندنی بالآدا بەشێوەیەکی بنچینەیی خۆی لە رەخساندنی هەلی ئەکادیمی بۆ توێژینەوە لە راستی‌یە زانستی و وردەکاری‌یە مەعریفی‌یەکاندا دەبینیتەوە ، ئەوا بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجانە پێویستە هەل بۆ ئەوانە بڕەخسێنرێت کە خاوەن لێهاتوویی زانستین و کارامەن لە ئەنجامدانی توێژینەوەدا . لەو سیفەتانەش کە پێویستە لە کەسێکی توێژەردا هەبێت ئەمانەن :

### ١ - خواست و ئارەزوو:

لەپێش وە لەکاتی هەڵبژاردن و ئامادەکردنی توێژینەوەکەیدا ، توێژەر ئەم ئارەزووەی بەرامبەر بە توێژینەوەکەی بۆ دروست دەبێت . بۆیە پێویستە لەسەری کە دڵنیا بێت ئەویش بە پرسیار لەخۆکردنی زۆر لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر.

### ٢ - ئارام و خۆڕاگری:

هەڵسەنگانی زانستی توێژینەوەکە بەندە لەسەر ئارام و خۆڕاگری ، چونکە کرداری توێژینەوە سەختەو بیروهۆش و لاشەو فیکرماندوو دەکات. وپێویستە توێژەر ئارامگر و سنگ فراوان بێت بۆ دەست بەسەراگرتن و پەیبردن بەهەموو وردەکاریەکانی توێژینەوەکەی .

### ٣ - بابەتی‌بوون و دادمەندی

پێویستە توێژەر بابەتی بێت لە بڕیاردان دەربارەی بیروڕای کەسانی دی و راوبۆچوونەکانیان بێ بایەخ لەقەلەم نەدات بەلەسەرخۆیی و دادپەروەرانە لەگەڵ خاوەن بیروراجیاوازەکاندا بدوێت .

### ٤-ڕاستگۆیی:

پێویستە لە نووسیندا بێتە دی دوور لە هەر دیاردەیەکی نابەجێ و ەسپاردەی زانستی پێویستی بە ئاماژەکردنە بەهەر گواستنەوەو لێوەرگرتنێك و گێڕانەوەی بۆ خاوەن یان دانەرەکەی . هەروەك دزی زانستی یان ئەدەبی بە خراپترین دیاردە دادەنرێت هاوکات لەگەڵ ئامادەکردنی توێژینەوەدا بۆیە یاساو دامەزراوەکان سزا دادەنێن لەسەر ئەم جۆرە لە تاوان .

### ٥-توانای ڕێکخستن:

پێویستە توێژەر شارەزایی هەبێت لە کارامەیی هونەریدا تا یارمەتی بدات ، لەئامادەکردنی پەیکەری ڕێکخستنی توێژینەوەکەیدا لەبەش و ناونیشان و لەبەرگ گرتن و چاپکردن و پێکهێنان و ڕەنوسکردنیداو ئەمەش بە ڕێکخستنی شکڵی ناودەبرێت . کەتوانای بابەتی بوونی توێژەری پێوەبەندە لەدارشتن و ئامادەکردندا .

### ٦-گومان و تێبینی:

گومانی زانستی سەلمێنەر بەلگەی زیرەکی و توانایی و دانایی توێژەرە کەوەك ئاماژەی شارستانی بەکاریان دەهێنێت لە هەنگاونان بەرەو نوێکاری و داهێنان ، بە قووڵبوونەوە لەماناو بیرۆکەکانداو گەیشتن بە بەرزترین دەرەنجام .

### ٧-زیرەکی و بەهرەمەندی:

زیرەکی لەبیرکردنەوەو هەڵبژاردن و پاڵفتەکردنی بیرۆکەکاندا ، هاوکات زیرەکی لە دارشتن و ئامادەکردن و هەڵبژاردنی وتەو ماناو شێوازی هەمەجۆردا .

### ٨-باکگراوندی زانستی:

پێویستە توێژەر شارەزایی هەبێت لەبواری پسپۆڕیەکەی و بابەتی توێژینەوەکەی ئەمەش پەیوەندی بە بیرۆکەی زانستیو وردەکاریو زانیاری باوەڕپێکراودوە هەیە کە توێژەر وەك کانگایەکی زانستی و دروستکەر پشتی پێ دەبەستێت ، لە ئامادەکردن و داڕشتنی توێژینەوەکەیدا .

### ٩- کارامەیی لە ئەنجامدانی توێژینەوەکەدا:

کارامەیی لە ئامادەکردن و داڕشتن و کۆنترۆلکردنی بیرۆکەکانی توێژینەوەکەو توانای دروستکردنی بەرنامەدار لەدانان و ئامادەکردندا . جا پەیوەندی بە ڕێکخستنی پلانی توێژینەوەکە یان دابەشکردنیەوە هەبێت یان ئەوەی پەیوەندی بە ڕێکخستنی مەنهەجی شێوازی توێژینەوەکەوە هەبێت لە نوسین و دەرهێناندا .توێژەر کارامەیی و لێهاتوویی‌یەکانی بەکاردەهێنێت لە کارکردن بە توانایی و بەهرەکانیەوەو دواترلە زاڵبوون بەسەر زانیاری و پێکهاتەکانی توێژینەوەکەدا. وێڕای بەکارهێنانی لە دۆزینەوەی تواناو ئاستە زانستی وعەقلی‌یەکانیداو پاشان هەڵسەنگاندنی .

### ١٠ -ڕاستی زانستی:

لەتوانای توێژەر بۆ بڕیاردان لەسەر کاروبارە زانستی‌یەکان و هەڵسەنگاندنیاندا خۆی دەبینێتەوە . هەروەها توانای توێژەر لە خستنەڕووی بیرۆکەو زانیاریەکان بەڕێگەیەکی ڕاست کە ناوەندگەریەکەی بریتی‌یە لە : شێوازی باش و ئاشکرا و دەربڕینی سەرکەوتوو پابەندبوون بە ڕێساکانی زمان و نوسین و داڕشتن دوور لە ئالۆزکاری .

## هەنگاوەکانی تۆمارکردنی توێژینەوەکە

توێژینەوەکە لە تۆمارکردنی‌یەوە تا پێشکەشکردنی بەچەند هەنگاوێکدا تێپەردەبێت :

١-هەڵبژاردنی بابەتەکە - بەشێوەیەکی گشتی لەلایەن توێژەر یان مامۆستای سەرپەرشتیار یان ئەو کۆلێژەوەیە کە توێژینەوەکەی تێدا ئامادەدەکرێت .

٢-ئامادەکردنی نەخشە - کەناونیشانە سەرەکیەکانی توێژینەوەکەش (ناونیشانی بەش وباسەکان ) دەگرێتەوە .

٣-بەدەستهێنانی رەزامەندی مامۆستای سەرپەرشتیار لەسەر پلانی توێژینەوەکە .

٤-بەدەستهێنانی رەزامەندی ئەنجومەنی ئەو بەشەی کە مامۆستای سەرپەرشتیار پەیوەستە پێوەی و بابەتی توێژینەوەکە لە بواری پسپۆریەکەیدایە ، وەك : بەشی مێژوو سەبارەت بە بابەتە مێژووییەکان ...تاد .

٥-بەدەستهێنانی رەزامەندی ئەنجومەنی ئەو کۆلێژەی کە توێژینەوەکەی لێ ئامادەدەکرێت ، بۆ ئەمەش پێویستە چەند مەرجێکی دیاریکراو لە بابەتی‌توێژینەوەکە یان توێژەردا هەبێت . سەبارەت بە بابەتی توێژینەوەکە : بەوەی کە نوێ و روون و پلان بۆ دانراو بێت . وە سەبارەت بە توێژەر پێویستە پلەی باش یان زۆر باشی بەدەست هێنابێت .

٦-ماوەی ئامادەکردنی توێژینەوە دوای دەرچوونی بریاری ئەنجومەنی کۆلێژ بەرەزامەندی نواندن لەسەر پەسەندکردنی توێژینەوەکە دەست پێدەکات و پێویستە توێژەر لەم ماوەیەدا توێژینەوەکەی ئامادەکردبێت.

سەبارەت بە نامەی ماستەر کەمترین ماوە دوو ساڵەو زۆرترین سێ ساڵ وە دەکرێت ماوەکە ساڵێك یان دوو ساڵی دی درێژبکرێتەوە دوای ڕەزامەندی نواندنی ئەنجومەنی کۆلیژ لەسەر داوای توێژەر .

٧-دوای کۆتایی هاتنی ماوەی ئامادەکردنی توێژینەوەکەو ئامادەنەبوونی توێژەر بۆ پێشکەشکردنی توێژینەوەکەی و ئەگەر ئەنجومەنی کۆلێژ کەمتەرخەمی لەلایەن توێژەرەوە بەدیکرد . ئەوا بریارێك دەردەکات بە هەڵوەشانەوەی تۆمارکردنی توێژینەوەکەو توێژەر مافی توێژینەوە لەدەست دەدات و بابەتەکە دەدرێت بە توێژەرێکی دی .

٨-لەکاتی ئامادەکردندا پێویستە توێژەر پەیوەندی بەردەوامی هەبێت بە مامۆستای سەرپەرشتیارو کۆلێژەوە .

٩-توێژەر دەتوانێت گۆرانکاری لاوەکی لە پلانی توێژینەوەکەدا ئەنجام بدات . بەمەرجێك کاریگەری لەسەر ناوەرۆکی بابەتەکە بەجێ نەهێڵێت وەك گۆرین یان ڕاستکردنەوەی ناونیشانی بەش یان باسەکان ... ئەمەش لەکاتی ئامادەکردندا .وەلەکاتێکدا کە توێژەر گۆرانکاری جەوهەری لەناونیشانەکاندا ئەنجام بدات بەشێوەیەك کە بابەتی توێژینەوەکە بگۆرێت . ئەوا لەم حاڵەتەدا ئەنجومەنی کۆلیژ بریارێك دەردەکات بە ڕەتکردنەوەی و داوا لە توێژەر دەکات کە بابەتێکی دی یان ناونیشانێکی نوێ ، هاوڕێ لەگەڵ پلانێکی نوێدا پێشکەش بکات بۆ تۆمارکردنی .

١٠ - کۆتایی هاتنی ئامادەکردنی توێژینەوەکە

١١ - بەدەستهێنانی مۆڵەتی مامۆستای سەرپەرشتیار بۆ چاپکردنی توێژینەوەکە . وەك چاپکردنێکی سەرەتایی و بۆ ژمارەیەکی کەم لەتیراژ کە کۆلێژ دیاری دەکات .

١٢ – دەرچوونی بڕیار لە ئەنجومەنی كۆلێژەوە بە پێكهێنانی لیژنەی هەڵسەنگاندن كە زۆربەی كات لە سێ ئەندام پێك دێت بەسەرۆكایەتی مامۆستای سەرپەرشتیار .

١٣ – دەرچوونی بڕیار لە ئەنجومەنی كۆلێژەوە بە دیاریكردنی بەرواروو كات و شوێنی هەڵسەنگاندنی توێژینەوەكە .

١٤ – بەشێوەیەكی گشتی هەڵسەنگاندنی توێژینەوەكە بە شێوەیەكی ئاشكرا ئەنجام دەدرێت و لەمیانەیدا توێژەر زانیاری و ڕێنمایی و ڕەخنەو هەڵەی پەیوەست بە توێژینەوەكەیەوە وەردەگرێت .

١٥ – لە كۆتایی هەڵسەنگاندنەكەدا ئەندامانی لیژنەكە بیروڕا دەگۆڕنەوە دەربارەی نامەكە بەشێوەیەكی نهێنیو لە شوێنێكی داخراوداو دواتر ئەنجامەكە ئاشكرا دەكەن لەبەردەم ئامادەبواندا بەپەسەندكردن یان ڕەتكردنەوەی نامەكە.

١٦-لەحاڵەتی ڕەزامەندی نواندن لەسەر نامەكە لەلایەن لیژنەی هەڵسەنگاندنەوە ڕاسپاردە دەردەچێت بۆ كۆلێژ یان زانكۆ ، بە بەخشینی پلەی ماستەر یان دكتۆرا بەكەسی سەركەوتوو ، وە پێویستە مامۆستای سەرپەرشتیارو ئەندامانی لیژنە ڕاپۆتەكانیان دەربارەی توێژینەوەكە بنوسن و لەگەڵ ڕاسپاردەكانیاندا ، بەرزبكرێنەوە بۆ ئەنجومەنی كۆلێژ .

١٧-دەرچوونی بڕیارێك لەئەنجومەنی كۆلێژەوەو دواتر بڕیارێك لەئەنجومەنی زانكۆوە بەڕەزامەندی نواندن و پەسەندكردنی نامەكە .

١٨- هەڵسەنگاندنی پلەكانی ماستەرو دكتۆرا بریتین لە :پەسەند ، باش ، زۆرباش ، بالا .

١٩- کۆتـا چـاپکردنی نامەکـە دوای ڕاسـتکردنەوەی هەڵـەکان و ڕەچـاوکردنی ئـەو زانیـاری و ڕینماییانـەی کەلـەکاتی هەڵـسەنگاندنەکەدا خراونەتەڕوو .

٢٠- لەحاڵەتی ڕەتکردنەوەی نامەکەدا جیاوازی دەکرێت لە نێوان دوو حاڵەتدا :

**حاڵەتی یەکەم** : ئەگـەر ڕەتکردنەوەکـە بـەهۆی نـەگونجانی نامەکـەوە بوو : وەك ئەوەی کە توێژینەوەکە کۆن بێت و هـیچ تازەیـەك پێشـکەش بـە کتێبخانەی زانـستی نـەکات یـان پێشـتر بابەتەکـەی تۆمـار کرابێـت یـان توێـژەرێکی دی ئـەنجامی دابێـت . ئـەوا لـەم حاڵەتانـەدا بەتـەواوی ڕەت دەکرێتەوەو مافی توێژەر هەڵدەوەشێتەوەو پێویستە بابەتێکی نوێ هەڵبژێرێت و جارێکی دی پێشکەشی بکـات بـۆ بەدەسـت هێنـانی ڕەزامەنـدی نـوێی ئەنجومەنی کۆلیژ . لێرەشەوە ماوەیەکی نوێ دەست پێ دەکات بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەکە .

**حاڵـەتی دووەم** : ئەگـەر ڕەتکردنەوەکـە بـەهۆی بـوونی هەڵـە یـان کاروباری شکڵییەوە بێت کە دەتوانرێت چارەسەر بکرێت ، بەبێ تێکـدانی ناوەڕۆکی توێژینەوەکە . ئەوا لەم حاڵەتەدا ڕەتکردنەوەکە یەکجاری نابێت ، بەڵکو هەلێکی دی بۆ توێژەر دەرەخسێنرێت ، بـۆ چارەسـەرکردنی هەڵـەو کەموکورِیـەکانی توێژینەوەکـەی و پاشـان کـاتێکی دی بـۆ دادەنرێـت بـۆ پێشکەشکردنی توێژینەوەکەی.

وە دەبێت ئەوەش بڵێین کە لەهەندێك لە زانکۆکانـدا ئاراسـتەیەك هەیـە جەخت لـەسەر هەڵوەشاندنەوەی پلەی نرخانـدنی نامـەی ماسـتەرو دکتـۆرا دەکاتەوە. چونکە پلەی هەڵـسەنگاندن کارێکی ڕێژەیییەو لە لیژنەیـەك یـان

بابەتێكەوە بۆ یەكێكی دی جیاوازە . وە نرخی نامەكە تەنها لەو پلەیەدا نی یە كە پێی بەخشراوە ، بەڵكو لەو توێژینەوەو چالاكی و زانستانەدایە كە توێژەر پێشكەشی دەكات .

# پێشەکی

## پێناسەی دەستنوس:

هەموو کتێبێکی نوسراو کەنوسەر بەدەست نوسیویەتیەوە ، جا بەنوسینی دەستی خۆی یان قوتابی‌یەکانی ...

وە دەستنوس هەیە; کە تیراژی بنچینەیی نوسەرە یان لەبەرگیراوەی ناوەندی و گواستراوەیە یان لە تیراژی ( ڕونوسی ) بنچینەیی‌یەوە وەرگیراوە .

وە وشەی دەستنوس بۆ هەموو ئەو کتێبانە بەکاردەهێنرێت کە نوسەر بەدەستی خۆی نوسیویەتی ، پێش بلاوکردنەوەی ئامێرە نوێیەکانی چاپەمەنی . هەروەك وشەی دەستنوس ئاماژەیە بۆ زانیاری پێشینانمان پێش سەدان ساڵ کە خۆی لە خۆیدا سامانێکی زانستی گەورەو گرنگە .

دەستنوسەکان سەرچاوەیچڕو بەجۆش و دایکی کتێبە نوێیەکانن، بنچینەی شارستانیەتی مرۆڤ و کۆشکی شاری هاوچەرخن، دەستنوسەکان گەنجینەی زانستی و بنەڕەتی زانستە نوێیەکانن .هەروەك ئەو زانستانەی کە ئێستا هەیە تەنها بەشێکە لە هەموو، و بەشێکی زۆر کەمە لەو زانستەی پێشینان کەپێمان گەیشتووە .

وە نرخی دەستنوسە زانستی‌یەکان تەنها ناگەڕێتەوە بۆ ئەو سامانە زانستیە زۆرەی کەلەخۆی گرتووە بەڵکو بۆ قورسی سود وەرگرتن لەم دەستنوسانە ; بەهۆی دەگمەنیی‌و ناوازەیی یان پارچەپارچەیی یان لەناوچوونی زۆربەی یان بەهۆی ئەوەی کە نەتوانراوە کۆبکرێتەوەو سودی

لێوەربگیرێت .هۆکارەکانی لە ناوچوونی دەستنوسەکانیش فرەن مرۆیی بن یان سروشتی .

ئەو دەستنووسانەی کە هێشتا ماون بە شێوەیەکی سنوردار سودیان لێ وەردەگیرێت ، بەهۆی پەرش و بلاوییان لە کتێبخانە جیهانی و کتێبخانەکانی پایتەخت و شارەکانی ولاتە پێشکەوتووەکان و مۆڵەت نەدانی حکومەتەکانیان بە خواستن یان فرۆشتنیان ، کە ئەمەش دەبێتە هۆی بێبەش بوونی کتێبخانەکان و دواتر توێژەران لە بەدواداچوون و بەدەست خستنیاندا ( کۆکردنەوەیاندا ) .

# باسی یەكەم

## مەرجەكانی بەدواداچوونی دەستنوس

### مەرجەكانی بەدواداچوونی دەستنوس :-

زانایان باسی كۆمەڵێك مەرجی گشتی و دیاریكراو دەكەن كە پێویستە لەبەدواداچوونی دەستنوسدا هەبێت ، چونكە ناتوانرێت بەدواداچوونی لەبارەی هەموو دەستنوسێكەوە بكرێت . لەو مەرجانەش :

١-بوونی زیاتر لە تیراژێك لەو دەستنووسە چونكە بەدواداچوونی دەستنوس لەتەواوكردنی ناتەواوی وزیادكردن و ئاماژەكردن بە خستنەسەرو لابردن و دەرهێنانی ناوی شوێن پێویستی بە بوونی تیراژی ترە لەگەڵ تیراژە بنچینەیی یەكەدا .

٢-دەبێت دەستنووسەكە پێشتر بەدواداچوونی لەبارەوە نەكرابێت ، بەلام ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت كە بلاونەكرابێتەوە . واتە دەكرێت بەدواداچوون بۆ دەستنوسێك بكرێت كە پێشتر بلاوكرابێتەوە بەلام بەدواداچوونی بۆ نەكرابێت .

٣-ئەگەر دەستنوسەكە بەدواداچوونی لەبارەوە كرابێت . بەلام هەڵەی زۆری تیادابێت ، ئەوا لەم حاڵەتەدا دەكرێت بەدواداچوونی بۆ بكرێت .

٤ – ئەگەر دەستنوسەكە بەنرخ بێت و شایەنی بەدواداچوون بێت .

بێجگە لەم جۆرە دەستنووسانەی خوارەوە كە بەدواداچوونیان بۆ ناكرێت :

أ – هەموو دەستنوسێك كەماددە زانستی یەكەی بێ بایەخ بێت .

ب– هەموو دەستنوسێك كە خاوەنەكەی وەك بەشێك لە كتێبی چاپكراو هەمووی نوسیبێت .

ج – هەموو دەستنوسێك كە كورتكراوەی كتێبی چاپكراو بێت .

ه – پێویستە قەبارەی دەستنوسەکە گونجاوبێت واتە گونجاوبێت لەگەڵ نرخە زانستی یەکەیداو ئەو هەوڵەی كە تێیدا دەدرێت . هەروەك دەستنووسی واهەیە لە( ١٠ ) لاپەڕە تێپەڕناكات كە ناكرێت بەدواداچوون لە بارەیەوە بكرێت .

# باسی دووەم

## هەنگاوەکانی بەدواداچوونی دەستنووس

### هەنگاوەکانی بەدواداچوونی دەستنووس :-

کرداری بەدواداچوونی دەستنوس تەنها چاپکردن نیە . بەلکو کاریکی ئالۆزە لەهەمان کاتدا . وەنرخی زانستی دەستنوس پێکهاتە زانستیەکەی تیدەپەرێنێت بۆجۆرو ئەندازەی هەولّدان بۆ زیندوکردنەوەی و پاراستنی لە تیاچوون بەشیوەیەك کە بتوانریت لەکتێبخانەکاندا نمایش بکریت و کەلّکی لێ وەربگیریت .

-دەتوانین هەنگاوەکانی بەدواداچوون و لیکۆلّینەوەی دەستنوس لەمانەدا کۆبکەینەوە:

١ – هەلّبژاردنی دەستنوسیك وەك بابەتی بەدواداچوون .

٢ –کۆکردنەوەی تیراژەکانی دەستنوسەکە .

٣ –ریکخستنی تیراژەکانی دەستنوسەکە.

٤ –بەدواداچوونی دەق لە دەستنوسەکەدا .

٥ – دابەشکردن و رەنوسکردنی دەستنوسەکە .

٦ – پیرستکردنی دەستنوسەکە .

### هەنگاوی یەکەم- هەڵبژاردنی دەستنوسەکە :

ئەمەش تیراژی بنچینەیی بابەتی بەدواداچوونەکەیە . وە شتێکی بەدیهی یە کە لیکۆلەر وەك هەنگاوی یەکەم ئەو دەستنوسە هەڵبژێریت کە دەیەوێت بەدواداچوونی لەبارەوە بکات و لەهەمان کاتدا مەرجەکانی تیدا هاتبیتەدی . وەك ئەوەی پیشتر بەدواداچوونی بۆ نەکرابیت و لەرووی زانستی یەوە بێ بایەخ نەبیت و قەبارەکەی گونجاو بیت ...تاد . ئەگەر ناونیشانی دەستنوسەکە نەزانراو بوو دەتوانریت بەدواداچوونی لەبارەوە بکریت بەرەچاوکردنی ئەم خالانەی خوارەوە:

أ- دەتوانریت بگەرێنریتەوە بۆ ناونیشانی تیراژی دەستنووسی دی .

ب- دەکریت بزانریت لەچ سەردەمیکدا نوسراوە . بە لیکدانەوەی هەنگاوەکانی و هەروەك هەر چەرخەو نوسینی بلاوی خۆی هەیە .

ج- بیەش نەبونی کتیبخانە لە دەستنوس وپاراستنی لە لەناوچوون و نەبەستنەوەی بەنەزانینی ناونیشانەوە .

لەگەل ئەوەشدا کۆمەلیك ریگر هەیە لەبەردەم دەستنوسی ناونیشان نادیارو نەزانراودا بۆ وەرگرتن و رەچاوکردنی مەرجەکان پیویستە توێژەر پەلەنەکات لە هەلبژاردنی دەستنوسەکەدا . وە پیش هەلبژاردنی بابەتەکە لیکۆلینەوەی چروو فراوان ئەنجام بدات و تۆمارگەی زانکۆکان بەسەر بکاتەوە بۆ دلنیابوون لەوەی کە دەستنوسە هەلبژیردراوەکەی بەناوی توێژەریکی ترەوە تۆمارنەکراوەو بلاونەکراوەتەوە .

**هەنگاوی دووەم-کۆکردنەوەی تیراژەکانی دەستنوسەکە:**

واتە کۆکردنەوەی تیراژی بنچینەیی و لاوەکی ،وە بە پێچەوانەی توێژینەوەوە ئەو سەرچاوانەی کە پێویستە لێکۆڵەر کۆیان بکاتەوەو پشتیان پێ ببەستێت لە بەدواداچوونی دەستنوسدا دیاریکراوو پەیوەستن بە تیراژە بنچینەیی و لاوەکیەکانی خودی دەستنوسەکەوە . وەکۆکردنەوەی تیراژەکانی دەستنوس بە تێڕوانین لە پێڕست و تۆماری ئەو دەستنوسانەی کە لەکتێبخانە گشتی و تایبەتەکاندا هەن دیتەدی .

لێکۆڵەر دەتوانێت پشت بە پسپۆڕو ئەمینداری کتێبخانەو ئەو کەسانە ببەستێت کە تیراژی دەستنوس کۆدەکەنەوە. وە ڕەنگە کارەکە پێویستی بەڕەزامەندی یان بڕیاری لایەنە بەرپرسەکان هەبێت . بۆ ئاسانکاری نواندن لەکرداری کۆکردنەوەدا لەحالەتی هەبوونی تیراژ لەکتێبخانەی ولاتە بیانی‌یەکاندا .

**چەمکی کۆکردنەوەی تیراژەکانی دەستنوس ئەمانە دەگرێتەوە:-**

ا-خوێندنەوەی خێراو گشتگیری هەموو. یان زۆرینەی تیراژەکانی دەستنوسی بنچینەیی یان ناوەندی .

ب-کۆکردنەوەی واتایی بە نوسینەوەی ناونیشانی تیراژەکانی دەستنوسەکەو ناوی دانەرەکان .

ج-کۆکردنەوەی ماددی تیراژەکانی دەستنوسەکە بە خواستن یان کڕین یان دیاری .

د-کۆکردنەوەی فۆتۆگرافی لە تیراژەکانی دەستنوسەکەدا بەتایبەتی دەستکەوتنی فیلمی تایبەت بە تیراژی بینچینەیی .

ە-كۆكردنەوەی دانەیی ( ژمارەیی ) تیراژە ناوەندیـیەكان . ئـەویش بـە كۆپیكردن یان نوسینەوەیان بەدەست یان ئامێری چاپ .

-هـەروەك لێكۆڵـەر خـۆی دەتوانیـت بڕیـاری هەڵبـژاردنی باشـترین و گونجاوترین بدات لە كرداری كۆكردنەوەو جۆرەكەیدا

**هەنگاوی سێهەم-ڕێكخستنی تیراژەكانی دەستنوسەكە :-**

بۆ ئەوەی سودی تەواو لە تیراژەكانی دەستنوسەكە وەربگیریـت و پشـتی پێ ببەسترێت لە بەدواداچوونەكەدا پێویستە ڕێكبخرێت .سـەرەتا پشـت بـە تیراژە بنچـینەیی‌یەكان دەبەسـترێت و پاشـان ئەوانـەی كـە زیـاتر ڕاسـت و دروستن دواتر ئەوانەی كە دێرین و كۆنن .

-كرداری ڕێكخستن لەكاتی پشت بەستن بە تیراژەكانی یـەك دەسـتنوس ئەمانە دەگرێتەوە :

ا- ئەو تیراژە بنچینەیی‌یەی كەنوسەر بەدەستی خۆی نوسیویەتی .

ب- پاشان ئەو تیراژە ناوەندیـەی كـە یـەكێك لـە قوتابیـەكانی دانـەری بنچینەیی نوسیویەتی یان نوسەر مۆڵەتی پێداوە.

ج- پاشان ئەو تیراژە ناوەندیەی كەلە تیراژی بنچینەیی وەرگیراوەو نوسەر ڕێی پێداوە .

د- دوایی ئەو تیراژە لاوەكی‌یـەی كـە یـەكێك لـە قوتابیـەكانی دانـەری بنچینەیی لەدەستنوسە بنچینەیەكەوەو لەسەردەمی دانەرەكەیـدا ( واتـە پـێش مردنی ) نوسیویەتی .

ە- دواتر ئەو تیراژە لاوەكیانەی كەلەدوای مردنی نوسەرەكەی نوسراوە، واتە لەسەردەمێكی تردا و بەپێی پێشینەیی ڕێكدەخرێت.

**هەنگاوی چوارەم- بەدواداچوونی دەق لەدەستنوسەکەدا:-**

ئەم هەنگاوە لــە گـرنگترین هـەنگاوەکانی بەدواداچـوونی لـێکۆڵینـەوەی دەستنوسە. کەبەهۆیەوەی هەنگاوەکانی چەسپاندنی ڕاستەقینەی دەستنوسەکە تەواو دەبێت و لەبەرگە تازەکەیدا دەردەکەوێت و ڕەنگی ڕاستەقینەی خۆی وەردەگرێت سەرەڕای کەڵك لێوەرگرتنی .

لەبەر گرنگی هەنگاوی بەدواداچوونی دەق ، زانایان چـەند بنەمایـەکیان بۆ داناوە کە پێویستە هەر لێکۆڵەرێك ڕەچاوی بکات ، لەوانەش :

١ – دڵنیـــابوون لەڕاســـتی و دروســـتی خـــودی دەستنوســـەکە بنچینەیی وناوەندیەکان کە جێگەی مەبەستن لە بەدواداچوونەکەدا.

٢ – جیاکردنەوەی تیراژەکانی دەستنوسەکەو ڕیکخسـتنیان بەشـێوەیەك کە سەرەتا ئاماژە بە تیراژە بنچینەیی یەکان بکرێت دواتر تیراژە ناوەندیەکان .

٣ – جیاکردنـەوەی تـیراژە ناوەندیـەکانی دەستنوسـەکەو ڕێکخسـتنیان بەپێی کۆنی و تازەیی .

٤ – دڵنیابوون لە ڕاستی و دروستی تیراژی بنچینەیی دەستنوسەکە . کە ئایا تیراژی بنچینەیی دانەرەو بەدەستی خۆی نوسیویەتی . وە ئایا زانیاریەکانی ناوی بنەڕەتین و لەگەڵ ئاستە فکری و زانستی‌یەکانیدا دەگونجێـت .پێویسـتە لێکۆڵەر لەوە دڵنیا بێت کە کتێبەکە بەڕاستی هی نوسەرێکی دیارەو لەناوی نوسەریش دڵنیا بێت .

٥ – لەحاڵەتی ونکردن و نـەمانی بەڵگەنامـە یـان تـیراژی بنچـینەییدا . پێویستە لێکۆڵەر ورد بێت لەبەدواداچوونی دەقدا ، بۆ ڕێگرتن لەهەر هەڵەو لادان یان ساختەکردنێکی زانستی بەسەر تیراژە بنچینەیی یەکەدا .

٦ - پێویستە لێکۆڵەر لەپەراوێزدا ئاماژە بەهەموو ئەو زیادکردنانە بکات کە دانەری دەستنوسی بنچینەیی لەکەسانی ترەوە وەریگرتووەو لەناو دەستنوسەکەیدا جێی کردوەتەوە . هەروەك پێویستە ئاماژە بە سەرچاوەی ئەو زیادکردنانەش بکات .

٧ - پێویستە لێکۆڵەر ئاماژە بەهەموو ئەو ڕاستکردنەوانە بکات کە دانەری دەستنوسەکە ئەنجامی داون بە زیادکردن بێت یان لابردن .

٨ - ئاماژەکردن بەهەر لابردنێك کە دانەری بنچینەیی لەهەر دەقێکی گواستراوەدا ئەنجامی دەدات .

٩ - پێویستە لێکۆڵەر ئەو زیادانەی کە لە تیراژە ناوەندیەکاندا هەیە بگوێزێتەوە بۆ تیراژی بنچینەیی وەلەپەراوێزداو بە ژمارەی بەش و لاپەڕەکەی ئاماژەی پێ بکات .

١٠ - لەحاڵەتی بوونی کەم وکورتی لەدەستنوسی بنچینەییدا : وەك نەبوونی وشە یان پیت یان ڕستەیەك لەدەقدا لێکۆڵەر دەتوانێت زیادی بکات ئەگەر دڵنیابوو لەماناو مەبەستەکەی .

١١ - لەحاڵەتی بوونی کەم و کورتی گەورە لەدەستنوسە بنچینەییەکەدا : وەك لاپەڕە یان باس یان بەشێکدا پێویستە لێکۆڵەر ئەو کەم و کورتیانە لەدەستنوسە ناوەندیەکانەوە تەواو بکات .

١٢ - لەحاڵەتێکدا کە لێکۆڵەر نەیتوانی ناتەواویەکە چاك بکات لەدەستنوسە بنچینەییەکەدا ، کەم بێت یان زۆر . ئەوا پێویستە ئاماژە بە کەم و کورتییەکە بکات ئەویش بە دانانی خاڵی ئاسۆیی بەپێی ژمارەی ناتەواویەکە . وە پێویستە لەپەراوێزدا ئاماژە بەوە بکات کە نەیتوانیوە کەم

وکورتی‌یەکە تـەواو بکـات و تـیراژە ناوەندیـەکانیش یارمەتیـدەری نـەبوون لەوبارەیەوە . هەروەك نابێت بەهەرەمەکی لەلایەن خۆیەوە تەواوی بکات .

١٣ - پێویستە گرنگی بدرێت بە ڕاسـتکردنەوەی هەڵـەی زمانـەوانی و نوسین و ڕێزمانی لەدەقدا .

١٤ - پێویستە ڕاوبۆچـوونەکانی نوسـەری بنچـینەیی لێکدانـەوەی بـۆ بکرێت و ڕونبکرێتەوە ، بەتایبـەتی ئەوانـەی ئـاڵۆز و نادیـارن لـە دەقـدا . هەروەك پێویستە لە پەراوێزدا ئاماژە بەلێکدانەوەو شیکردنەوەکە بکرێت .

١٥ - پێویســـتە ئـــەو زاراوە زانســـتی و هونەریانـــەی کەلـــە دەستنوسەبنچـینەیی‌یەکەدا هـاتوون و دانـەری بنچـینەیی خـۆی نوسـیونی شیبکرینەوە . وە دواتر بیردۆزەکانی شیکار بکرێت و بەدرێژی باس بکرێت.

١٦ - وەسفی حاڵەتی دەستنوسەکە بکرێت لە ڕووی پەڕەو مەرەکـەب و وێنەو شێوەوە .

١٧ - دانـانی پێشـەکیەك بـۆ ڕونکردنـەوەی بیرۆکـەی دەستنوسـەکەو بەخشینی زانیاری تـەواو لەباردیـەوە وەك ناسـاندنی پێکهاتـەو بابەتـەکانی و گرنگی و نرخە زانستی‌یەکەی و ئاستی زانستی نوسەرەکەی .

١٨ - وەرگێڕانی دەستنوسەکە ئەگـەر بـە زمـانی بیـانی نوسـرابوو وە پێویستی دەکرد بەزمانی لێکۆڵەر بێت .

ودلەحاڵەتی وەرگێڕاندا پێویستە توێژەر تـەواو وردەکـار بێـت وە پابەنـد بێت بە کرداری بەدواداچوونەوە بە پاراستنی ڕۆحی دەقەکە لەڕووی مانـا و وێنە .......تاد.

١٩ – پێویستە بەڵگە شەرعیەکانی ناو دەستنوسە بنچینەیی یەکە دەربهێنرێت و لێکۆڵەر لەپەراوێزدا ئاماژە بەناوی سورەت و ژمارەی ئایەتەکە بکات وە بەهەمان شێوە ئاماژە بەسەرچاوەی فەرمودە بکات.

٢٠ – دەرهێنانی وتەی ئەو شارەزایانەی کەدانەری بنچینەیی لەدەستنوسەکەیدا بەبەڵگە هێناویەتیەوە . ئەویش کورتە باسێك دەربارەی ناوو ژیان و نوسراوەکانیان لەپەراوێزدا .

٢١ – دەرهێنانی بابەتی وەرگیراوی ئەدەبی لەوانەش :دێرە شیعر یان وتاری نوسەر . ئەویش بەناوهێنانی هۆنراوەکەو ئەو دیوانانەی کە تییدا تۆمارکراوەو هەروەها ناوی شاعیرو پوختەیەك لەناوو ژیان و سەردەم و بەناوبانگترین هۆنراوەو دیوانەکانی .

٢٢ – وەرگێرانی ژیانی ، ناوو کەسایەتی‌یە ناسراوەکانی ناو دەستنوسە بنچینەیەکە. ئەویش بە ئاماژەکردنی بە ناوو نازناوو پلەی زانستی و کۆمەلایەتی ئەو چەرخەی تیایدا ژیاون لەگەڵ کارەکانیان .

٢٣ – دەرهێنانی ناوی ئەو شوێن و ولاتانەی کەلەدەستنوسە بنچینەیی‌یەکەدا هاتوون و لیکوڵەر ئەو وڵات و شوێنانە لە پەراوێزدا پێناسە دەکات و ئاماژە بە مێژوو، سەردەم و پێگەو ناوە کۆن و نوێیەکانی دەکات. بۆیە پێویستە لێکۆڵەر پشت بەپەرتوکی مێژوو ، جوگرافیای کۆن و نوێ بەستێت .

٢٤ – دروستکردنی پوختەیەکی سەرەتایی وەك پێشەکیەك بۆ ئەو دەستنوسەی کە لێکۆڵینەوەی لەبارەوەکراوەو توێژەر ئەمانەی تێدا باس دەکات :

أ– پێناسەی بابەت و گرنگی دەستنوسەکە.

ب- باسکردنی دەستنوسەکە : لەڕووی وێنەو شێوەو لاپەڕەو هەندێك لەپێکهاتەو بابەتەکانی .

ج- باسکردنی ئەو تیراژە ناوەندیانەی کە توێژەر لەبەدواداچوونەکەیدا پشتی پێبەستون لەگەڵ ناوبردنی مێژووی نوسین و شوێن و چەرخەکەیدا لەگەڵ وێنە بۆ هەندێك لەلاپەڕەکانی ئەگەر توانرا .وە ژمارەی تیراژە وون بوو یان لەناوچووەکان.

د- ئەو کەس و ڕوناکبیرو زانایانەی کە توێژەر پشتی پێبەستون لەبەدواداچوونەکەیداو ئەندازەی بەشداریکردنی هەریەکەیان لەبەدواداچوونەکەدا.

و- ئەو بارودۆخەی کەبەدواداچوونی دەستنوسەکەی پیادا تێپەڕبووە .

٢٥ - دروستکردنی پوختەیەکی کۆتایی وەك کۆتایی دەستنوسەکە کە تێیدا توێژەر باسی دەرەنجام و پوختە زانستیەکانی بەدواداچوون دەکات . وێرای ئەو دۆزو بابەتە گرنگانەی کە دەستنوسەکە دەیوروژێنیت . هەروەها ئەو کەلکە زانستیانەی چاوەڕوانکراوە .لەگەڵ تێبینی لێکۆڵەر لەسەر دەرەنجامەکانی کرداری بەدواداچوونەکە .

**هەنگاوی پێنجەم- دابەشكردن و ڕەنوسكردنی دەستنوسەكە:-**

لیكۆلەر دەستنوسەكە دابەش دەكات بۆ: بەش- باس- بابەت-لق-بەند یان برگە(**باب-مبحث- مطلب-فرع-بند**).

**بەلام ڕەنوسكردن دوو جۆرە:**

أ- ڕەنوسكردنی ئەلف بێ:یان ڕەنوسكردنی كەسایەتی و فەرموودەكان :

فەرموودەكان وكەسایەتی و ناوە ناسراوەكانی ناو دەستنوسەكە بەپێی ژمارە ڕەنوس دەكرێن .

ب- ڕەنوسكردنی زمانەوانی:

بەدانانی هێمای ڕەنوسكردن هەریەكەو لەشوێنی خۆیدا :

وەك خاڵ لەكۆتایی ڕستەداو كۆما لەدوای بانگكراوو لەنێوان ڕستەی مەرج و بەشەكانیداو هەروەها لە نێوان سوێند و وەلام دا وەهەروەها هەریەكە لەهێماكانی دی كە پێشتر باسكران .

**هەنگاوی شەشەم- پێرستكردنی دەستنوسەكە:**

كە ئەمیش دوو جۆرە

**أ- پێرستكردنی بابەت و شوێنەكان:**

لیكۆلەر پێرستێك دادەنێت .بۆ بابەت و ناونیشانی بەش وباسەكان . كە ئەویش بە جیاوازی جۆری بابەتەكان دەگۆڕێت.

ئەگەر دەستنوسەكە هۆنراوە بوو ئەوا لیكۆلەر پێرستێك بۆ سەروا دادەنێت. وە ئەگەر كتێبی فەرموودە بوو پێرستێك بۆ فەرموودەكان دادەنێت. بە ڕێكخراوی و بە پێی ئەلف بێ وەئەگەر لەكتێبی مێژوویدا بوو ئەوا پێرستێك بۆ گرنگترین ڕووداو كەسایەتیەكان دادەنێت .ئەگەر كتێبی

جوگرافی بوو ئەوا پێڕستێك دادەنێت بۆ گرنگترین شوێن و وڵات و ناوچـە
کە بەپێی ئەلف بێ ڕیکخرابن .......تاد .

## ب-پێڕستکردنی سەرچاوەکان:

ئـەو سەرچـاوانەی کـە لیکولـەر پشـتی پیبەسـتوون لـە بەدواداچـوونی
دەستنوسەکەیدا ، بەم شێوەیە:

١-کتێبی تەفسیر .

٢-کتێبی فەرموودە .

٣-ڕونوسی سەرچاوەی کۆن .

٤- سەرچاوەی نوێ .

٥ - کتێبی زمانی بیانی کە باشتروایە بە پێی ئەلف بێ ڕێکبخرێن . سەرەتا
ناوی نوسەر پاشان زانیاری تەواو دەربارەی سەرچاوەکە بنوسرێت.

## پێڕست


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| پێشەکی | ٣ |
| **بەشی یەکەم**<br>توێژینەوەی زانستی | ٥ |
| **باسی یەکەم**<br>دامەزراوەکانی توێژینەوەی زانستی | ٨ |
| **باسی دووەم**<br>جۆرەکانی توێژینەوەی زانستی | ١٠ |
| **باسی سێیەم**<br>بنەماکانی توێژینەوەی زانستی | ١٨ |
| **باسی چوارەم**<br>هەنگاوەکانی ئامادەکردنی توێژینەوەی زانستی | ٢٥ |
| شێوەکانی وەرگرتنی زانیاری | ٤٥ |
| **باسی پێنجەم**<br>ڕێکخستنی توێژینەوەکە | ٦٠ |
| سیفەتە گشتییەکانی توێژەر | ٦٥ |
| هەنگاوەکانی تۆمارکردنی توێژینەوەکە | ٦٨ |
| **بەشی دووەم**<br>دەستنوسەکان | ٧٣ |
| پێناسەی دەستنوس | ٧٤ |

| | |
|---|---|
| **باسی یەکەم**<br>مەرجەکانی بەدواداچوونی دەستنوس | ٧١ |
| **باسی دووەم**<br>هەنگاوەکانی بەدواداچوونی دەستنووس | ٧٨ |
| پێڕست | ٨٩ |

جمعية آرا
للبحوث والدراسات

# preparing Scientific Research

# إعداد البحث العلمي

د. غازي عناية
ت. بهرة محمد علي

الطبعة الثانية
2006

ژمارەی سپاردن : (٩٣٢) ی ساڵی ٢٠٠٥ی پێدراوە